## ئانتوان دۆ سانت ـ ئێگزۆپێری

# شازادەچکۆل



وەرگێڕانی:

خەبات عارف و بەڕۆژ ئاکرەیی

## بۆ لیۆن وێرث (Leon Werth)

داوای لێبووردن لە منالآن دەکەم کە ئەم کتێبەم بە گەورەیەک پێشکەش کردووە. بۆ ئەم کەتنەم هۆیەکیش هەیە: ئەو گەورەیە چاکترین هاوڕێی منە. هۆیەکی تر ئەوەیە کە ئەو گەورەیە دەتوانێ لە هەموو شتێک بگات، تەنانەت لەو کتێبانەش کە بۆ منالآن نووسراون. هۆی سێیەمیش ئەوەیە کە: ئەم گەورەیە لە فەرەنسا ژین دەباتە سەر و هەر لەوێش لە سەرماندا هەڵدەلەرزێت، ئەو برسییە و پێویستی بە شتێکە دڵی بداتەوە. ئەگەر تێکڕای ئەم هۆیانەش پاکانەی ئەم کەتنەم نەبن، بهێڵن ئەم کتێبە پێشکەش بەو هاوڕێیەم بکەم، کە جارێک لە جاران منالّ بووە. ئاخر، ڕۆژێک لە ڕۆژان، هەموو مرۆڤە گەورەکانیش منالّ بوون (هەرچەندە کەمیان ئەمەیان لە بیر ماوە.) کەواتە منیش پێشکەشکردنەکە بەم چەشنە دەگۆڕم:

بۆ لیۆن وێرث
کاتێ کە منالّ بوو

ئانتوان دۆ سانت ــ ئێگزۆپێری

شازادەچکۆل
ئانتوان دۆ سانت ـ ئێگزۆپێری
وەرگێڕانی: خەبات عارف و بەرۆژ ئاکرەیی

*Bokförlaget Aura*
چاپی دووەم ٢٠١٠

# ١

کە تەمەنم شەش ساڵان بوو، کتێبێکم لەبارەی دارستانە دەستلێنەدراوەکانەوە خوێندەوە. ناوی کتێبەکە «چیرۆکە ڕاستەقینەکان» بوو و وێنەیەکی تێدا بوو، وێنەی مارێکی «بووا» کە خەریک بوو گیانلەبەرێکی کێوی هەڵدەلووشی. وێنەکە بەم چەشنە بوو:



لە کتێبەکەدا نووسرابوو: "ماری بووا هەروا بە ساغی و بێی ئەوەی بیجوون، نێچیرەکەیان هەڵدەلووشن. دوای هەڵلووشینیش لە شوێنی خۆیان ناجووڵێن و شەش مانگی ڕێک لێی دەخەون تا هەزمی دەکەن."
کە ئەمەم خوێندەوە، کەوتمە بیرکردنەوە لەو شتانەی لە دارستانەکاندا ڕوویان دەدا و توانیم بە تەباشیرێکی ڕەنگین

یەکـــەمین وێنـەی ژیانم بکێـشم. یانی وێنـەی ژمـارە یەک کــە بەم شێوەیە بوو:



شـاکارەکەمم خسـتـە بەرچاوی گەورەکان و لێم پرسین، کە ئاخۆ کاتێ سەیری دەکەن لە وێنەکەم دەترسن.
وەڵامیان دامەوە: "جا مرۆڤ بۆ دەبێت لە کڵاو بترسێت؟"
ئەو وێنەیەی کە کێشابووم، کڵاو نەبوو، بەڵکە وێنەی مـارێکی بووا بـوو کـــە خـــەریکی هـەزمکـردنـی فـــیلێک بوو. دواتـر، بۆ ئـەوەی گەورەکـان تێی بگەن، دانیشـتم و وێنەی نـاو سکی مارەکـەم کێشا. ئاخر دەبێت هەمیشە شتـەکان بۆ گەورەکان ڕوون بکەیتەوە. وێنەی دووەمم بەم شێوەیە بوو:



گەورەکان پێیان وابوو کە واز لە کێشانەوەی ئەو وێنانە بهێنم کە ماری بووا لە ناوەوە و لە دەرەوە پێشان دەدەن و لەبری ئەوە باشترە خۆم بە مێژوو، جوگرافیا، بیرکاری و ڕێزمانەوە خەریک بکەم. بەم چەشنە بوو کە لە تەمەنی شەش ساڵیدا وازم لە داهاتوویەکی پڕشنگدار هێنا، کە چاوەڕێی وێنەکێشێکی خۆمئاسایی بوو. کە بینیم وێنەی یەکەم و دووەمم هیچیان بە هیچ نەکرد، ئیتر دڵم لە وێنەکێشان سارد بووەوە. گەورەکان خۆبەخۆ لە هەرشتێک تێناگەن و بۆ ئێمەی منداڵیش ماندووێتیهێنە هەمیشە و بەردەوام ناچار بین هەموو شتێک بۆ گەورەکان ڕوون بکەینەوە.

لەبەر ئەوە ناچار بووم کارێکی تر بۆ خۆم هەڵبژێرم و کەوتمە شوێن فێربوونی فڕۆکەوانی. زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم تا ئێستا هەموو دنیام بەسەر کردۆتەوە و جوگرافیاش لەوەدا خزمەتێکی چاکی پێکردووم. دەتوانم هەر بە تێڕوانینێک «چین» و «ئاریزۆنا» لە یەکتری جیا بکەمەوە. ئەگەر مرۆڤ لە شەوی ئەنگوستەچاودا شوێنەون بێت، جوگرافیا چاک بە هانایەوە دێت.

هەر لەم ڕێگایەوە بووە کە توانیومە لە ژیانمدا بەرەو ڕووی کۆڕوکۆمەڵی خەڵکی ماقووڵ ببمەوە. گەلێک مرۆڤی گەورەم بینیون، لەگەڵیاندا ژیاوم و هاتوچۆم کردوون. کەچی ئەم کارە هەرگیز بۆچوونێکی جیاوازتری لەبارەی ئەوانەوە پێ نەبەخشیووم. هەر کە بە یەکێکیان دەگەیشتم و پێموابوو نەختێک لەوانی تر ژیرترە، بە نیشاندانی وێنەی ژمارە یەک، کە تا ئەو کاتەش هەر مابووم، هەڵمدەسەنگاند. دەمویست بزانم ئاخۆ ئەویش لە هیچ شتێک تێ دەگات. کەچی هەمیشە هەر هەمان وەڵامم دەست

دەکەوتەوە: "ئەمە کڵاوێکە." – منیش ئیتر نە باسی بووام بۆ دەکرد و نە لەمەڕ ئەستێرە و دارستانە دەستلێنەدراوەکانەوە بۆی دەدواوم. بەڵکە لەمەڕ یاریی «بریج» و «گۆڵف» و سیاسەت و ملپێچەوە دەدواین و ئەویش، ئەو مرۆڤە گەورەیە، خۆشحاڵیی خۆی دەردەبڕی کە بەرەوەڕووی کەسێکی ژیر و ماقووڵ بۆتەوە.

٢

بەم چەشنە، بێ ئەوەی کەسێکم هەبێت دوو قسەی لەگەڵدا بکەم، ڕۆژگارم لە تەنیاییدا بەسەر دەبرد. تا ئەوەی شەش ساڵ بەر لە ئێستا ناچار بووم لە بیابانێکی وشک و بێ ئاودا بنیشمەوە. پارچەیەک لە مەکینەی تەیارەکەم شکابوو و منیش کە نە میکانیکێکم لەگەڵدا بوو و نە هاوسەفەرێک، ناچار بووم مشووری خۆم بخۆم و خۆبەخۆ خەریکی چاککردنەوەی فڕۆکەکەم بم. کێشەی مەرگ و ژیان بوو. ئاوی خواردنەوەشم هەر هێندە پێ بوو کە لە هەفتەیەک زیاتر بەشی نەدەکرد.
شەوی یەکەمم لەسەر لم و سەد میل دوور لە گشت ئاوەدانییەکەوە بەسەر برد. دابڕاوتر لە هەر کەسێک کە کەشتییەکەی لە ناوەندی زەریای ئەتڵەسدا شکا بێت و خۆی بە کەڵەکێکەوە گیر کردبێت. کەواتە دەتوانیت بیهێنیتە پێش چاوی خۆت کە تووشی چ حەپەسانێک بووم کاتێ لە بەرەبەیاندا دەنگێکی سەیر و ناسک لە خەو ڕاپەڕاندم و گوتی: «بێزەحمەت وێنەی بەرخێکم بۆ بکێشە!».

– ها؟
– بەرخێکم بۆ بکێشە...
وەک ئەوەی برووسکە لێی دابم، لە شوێنی خۆم ڕاچەنیم، بەرز بوومەوە و چاوم هەڵگلۆفین. لە دەوروبەری خۆم وردبوومەوە و، چاوم بە مرۆڤێکی بچکۆلانەی سەیر و دەگمەن کەوت، کە بە ویقارەوە لێی دەڕوانیم. دواتر هەوڵمدا وێنەیەکی بکێشم و ئەمەش باشترینی ئەو وێنانەیە کە دواتر توانیم بیانکێشمەوە، هەرچەند ئەوەی من کێشاومە لە کوێ و خۆی لە کوێ! ئەمەش خەتای من نییە، گەورەکان، هەر لە تەمەنی شەش ساڵانەوە، لە نیگارکێشان دڵساردیان کردمەوە و منیش بێجگە لە کێشانەوەی ئەو وێنانەی ماری بووا لە ناوەوە و لە دەرەوە پێشان دەدەن، فێری هیچ شتێکی تر نەبووم.
بە چاوانێکەوە کە لە سەرسامیدا خڕ ببووبوون، لەو بەژنە بچکۆلەیەم دەڕوانی کە لە ئاستمدا قیت ببووبووەوە. لە بیرتان نەچێت کە من لەو دەمەدا سەدان میل لە گشت ئاوەدانییەکەوە دوور بووم و مرۆڤە بچکۆلەکەش نە لەوە دەچوو ڕێگای لێ ون بووبێت، نە لەوەش کە لە ماندوویێتی، یان لە برسان، یان لە تینووان و لە ترساندا نیوەگیان بووبێت. هیچ شتێکی لە منداڵێک نەدەچوو کە سەدان میل دوور لە گشت ئاوەدانییەک و لە بیابانێکدا ون بووبێت.
کە زمانم پژایەوە، پێمگوت:
– تۆ لێرە چی دەکەیت؟
بە نەرمی بەڵام وەکوو فەرمانێک، وەک ئەوەی داخوازەکەی گەلێک بەلاوە گرنگ بێت، گوتییەوە:



ئەمە جوانترین وێنەی شازادەچکۆلە کە من کێشابێتم

– بێزەحمەت بەرخێکم بۆ بکێشە!
مرۆڤ کە هیچ لە ڕووداوی ڕووداوێک ناگات، لە ملکەچی زیاتری بۆ نامێنێتەوە. هەرچەندە دیمەنەکە بەگشتی ناجۆر دەهاتە پێش چاوم، لەو جێیەدا کە سەدان میل لە گشت ئاوەدانییەکەوە دوور بووم و خۆم لە ئاست مەترسیی مەرگدا دەبینییەوە، بەڵام پارچەکاغەزێک و قەڵەمێکم لە گیرفانم دەرهێنا ... بەڵام هەر ئەوسا ئەوەم بیر کەوتەوە کە من تەنیا فێری جوگرافیا و مێژوو و بیرکاری و ڕێزمان بووبووم و، بە تۆزێک بێتاقەتییەوە پێمگوت، کە نازانم وێنە بکێشم.
وەڵامی دامەوە: "قەیناکا، وێنەی بەرخێکم بۆ بکێشە!"
جا چونکە پێشتر وێنەی هیچ بەرخێکم نەکێشابوو، دەستم بە کێشانەوەی یەکێک لەو دوو وێنەیە کرد کە لە هەموویانم باشتر دەزانی، ئەو وێنەیەی کە مارێکی بووا لە دەرەوە پێشان دەدات. تووشی حەپەسانێک بووم هەر مەپرسە! کاتێ کوڕە بچکۆلانەکە گوتی:
– نا! نا! فیلی ناو سکی بووام ناوێت. بووا مارێکی زۆر ترسناکە و فیلیش زلە و جێگایەکی زۆر دەگرێت. لە ماڵەکەی مندا گشت شتێک بچووکە، من پێویستیم بە بەرخێکە. وێنەی بەرخێکم بۆ بکێشە.



کە خەریکی کێشانی وێنەکە بووم، بە وردی لێی دەڕوانی و پاشان گوتی:
– نا! ئەم بەرخە لە نەخۆش دەچێت. یەکێکی ترم بۆ بکێشەوە.
یەکێکی ترم کێشا. زەردەیەکی شیرینی هاتە سەر لێو و بەوپەڕی لەخۆبووردنەوە گوتی:
– خۆت چاک دەیبینیت... ئەمە بەرخ نییە، بەرانە. ئەوەتا قۆچی هەیە...





وێنەیەکی ترم کێشا و ئەویشی بە دڵ نەبوو.

– ئەمەیان زۆر پیرە... من بەرخێکم دەوێت چەندین ساڵ بژێت...

ئیتر تاقەتم چوو بوو، چونکە بەپەلە بووم و دەبوو بە چاککردنەوەی مەکینەی فڕۆکەکەوە خەریک بم و ئەم وێنەیەم کێشا و پاشان بە پەلە پێم گوت:

– ئەمە سندووقێکە. ئەو بەرخەی تۆیش دەتەوێت لەناویدایە.

سەرم سووڕما کاتێ بینیم داوەرە بچکۆلانەکەم ڕووخساری گەشایەوە و گوتی:



– ئەمە ڕێک ئەو شتەیە کە من دەمویست! پێتوایە ئەم بەرخە پێویستی بە گیایەکی زۆر بێت؟

– بۆچی؟

– چونکە لای من لە هەموو شتێک نەختێک هەیە...

– ئەو نەختە بەشی دەکات! ئەم بەرخەی داومە بە تۆ، بەرخێکی زۆر بچووکە.

سەری بەسەر وێنەکەدا شۆڕ کردەوە.

– هێندە بچووکیش نییە... سەیرکە! خەوی لێکەوتووە...

ئا بەم چەشنە بوو کە لەگەڵ شازادەچکۆل ئاشنا بووم.

## ٣

مـــاوەیـەکی زۆری خـــایاند تـا بـۆم دەرکـــەوت لە کـــوێـوە هـاتـووە. شـازادەچکۆل، کـە بـەردەوام پرسـیـاری لـێ دەکـردم، وەکـوو ئـەوە وا بوو قـەت پرسـیـارەکـانـی من نـەبیسـتـێت. کـەم کـەم، بـەو قسـانـەی بە هـەڵکـەوت لـە دەمـی دەردەچـوون، هـەندێک شـتـیم لا ڕوون دەبـووەوە. بۆ نمـوونە کـە یەکـەم جـار فـڕۆکـەکـەمی بینی (نـامـەوێت وێـنەی فڕۆکەکە بکێشم، چونکە کارێکی زەحمەتە) لێی پرسیم:

– ئەم شتە چییە؟

– ئەمە «شت» نییە: ئەمە دەفڕێت. فڕۆکەیە. فڕۆکەی منە.

بەوەی کە پێم گوت من کەسێکم کـە دەفڕم، هـەستم بە بەخۆدانازین دەکرد و ئەویش بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

– چی؟ تۆ لە ئاسمان بەربوویتەوە؟

بە شەرمەوە گوتم:

– بەڵێ.

گوتی:

– ئای! ئەمەیان زۆر سەیرە!

شـازادەچکۆل هـێـندە پڕ بە دڵ پێکەنی، بەتـەواوی نـاڕەحـەتی کـردم. لەڕاستیدا من دەمەوێت خەڵک کێشەکانم بە جیددی وەربگرن.

کە تێروپڕ پێکەنی گوتی:

– دەی، کـــەواتە تـۆش لە ئـاســـمـــانەوە هـاتـوویت! خـــەڵکی کـــام ئەستێرەیت؟

وردە وردە خـەریک بوو تیـشکێک دەکـەوتە سـەر تـاریکایی مـەتەڵی

بوونی ئەو و بەپەرۆشەوە لێم پرسی:
- کەواتە تۆش لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتوویت؟
بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە. بەهێواشی سەری بەرز کردووە و سەیری فرۆکەکەی کردم:
- ئەوە زۆر ڕاستە... تۆ بەم شتەوە نابێت لە شوێنێکی دوورەوە هاتبیت و...
دیسان، بۆ ماوەیەکی درێژ، نوقمی تێڕوانین بوو. پاشان وێنەی بەرخەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و کەوتە تەماشاکردنی ئەو گەنجینە بەنرخە.
دەتوانیت بهێنیتە پێش چاوی خۆت، من چەند بەو نیمچە دانپیانانە دەربارەی "ئەستێرەکانی تر" گوێقولاغ بووم و بێگومانیش هەوڵم دا قسەی زیاتری لێ دەربکێشم.
- تۆ لە کوێوە هاتوویت، بچکۆل؟ "لە ماڵی مندا" لە کوێیە؟ دەتەوێت خۆت و بەرخەکەت بۆ کوێ برۆن؟



دوای ئەوەی ماوەیەک ڕاما و بیری کردەوە گوتی:
- باشییەکەی ئەو سندووقەی داوتە بە من ئەوەیە کە بەرخەکەم شەوانە دەتوانێت تێیدا بنوێت.
- بێگومان. ئەگەر کوڕێکی چاکیش بیت، گوریسێکت دەدەمێ تا بتوانیت ڕۆژانە بیبەستییەوە. هەروەها گوڵمیخێکیش...



شازادەچکۆل لەسەر ئەستێرۆکەی ب. ٦١٢

پێشنیارەکەم نەختێک شازادە چکۆلەی شڵەژاند:
– ئای لەمە! بەرخەکەم ببەستمەوە؟
– ئاخر ئەگەر نەیبەستییەوە دەڕوات و ون دەبێت.
هاوڕێ بچکۆلانەکەم دیسان لە قاقای پێکەنینی دا:
– جا بۆ کوێ دەچێت؟
– خوا دەزانێت. بۆ هەر جێیەک. ڕاستەوڕاست بۆ...
ئەوجا شازادە چکۆل بە جیددییەوە گوتی:
– جا چییە با بڕوات... خۆ لە ماڵەکەی مندا گشت شتێک بچووکە!
دواتر بە دەنگێکی خەماوییەوە گوتی:
– ڕاستەوڕاستیش بڕوات، ناتوانێت هێندە دوور بکەوێتەوە.

٤

بەم چەشنە بوو کە شتێکی گرنگی تریشم بۆ دەرکەوت: ئەو ئەستێرەیەی ئەو لێوەی هاتبوو، هەر نەختێک لە ماڵێکی ئاسایی گەورەتر بوو.
ئەمەیان هێندە مایەی سەرسووڕمان نەبوو، چونکە دەمزانی کە بێجگە لە گۆی زەوی و ئەستێرەکانی «کەیوان» و «تیر» و «ناهید» (کە هەرکامێکیان ناوێکی تایبەتیان بۆ دانراوە)، سەدان ئەستێرەی دیکە هەن، کە هەندێک جار هێندە بچووکن تەنانەت بە دووربینی ئەستێرەوانیش نابینرێن و هەرکاتێکیش ئەستێرەناسێک یەکێکیان بدۆزێتەوە، لەبری ناو، ژمارەیەکیان لێ دەنێت. بۆ نموونە ناوی دەنێت «ئەستێرۆکەی ٣٢٥١».

من بەڵگەی چاکم هەن کە دەیسەلمێنن ئەو ئەستێرەیەی شازادەچکۆل لێوەی هاتبوو، ناوی ئەستێرۆکەی «ب. ٦١٢» بوو. ئەو ئەستێرۆکەیە تەنیا جارێک بە دووربینی ئەستێرەناسی بینرابوو، ئەویش لە ساڵی ١٩٠٩دا و لە لایەن ئەستێرەناسێکی تورکەوە بوو. ئەو ئەستێرەناسە لە کۆنگرەیەکی ئەستێرەناسیی جیهانیدا بە درێژی لەو بارەیەوە دوا، بەڵام چونکە جلوبەرگێکی رێکوپێک و جیاوازی لەبەردا نەبوو، کەس بڕوای بە قسەکانی نەکرد. گەورەکان ئاوان!



ئەستێرۆکەی ب. ٦١٢ لەوانە بوو قەت هێندە قسەی لەسەر نەکرایە و نەناسرایە، ئەگەر تورکێکی دیکتاتۆر و کەللەڕەق هەڕەشەی لە میللەتەکەی خۆی نەکردایە بەوەی ئەگەر بێت و جلوبەرگی ئەوروپایی لەبەر نەکەن سزای مەرگیان بەسەردا دەدات. ئەوسا ئەستێرەناسەکە لە ساڵی ١٩٢٠دا و بە جلوبەرگێکی ڕێکوپێکەوە بەڵگەکانی خۆی خستەوە بەر دەست و ئەمجارەیان هەموویان گوێیان لە قسەکانی گرت.

من لەبەر خاتری گەورەکانە ئەم شتە وردانە لەمەڕ ئەستێرۆکەی «ب. ٦١٢»ەوە دەگێڕمەوە و، تەنانەت مۆڵەتی ئەوەشت دەدەم



ژمارەکەی بزانیت، چونکە گەورەکان شەیدای ژمارە و پێوانن. کاتێ لەگەڵ گەورەکاندا لەمەڕ هاوڕێیەکتەوە بدوێیت، هەرگیز لە شتە بنەڕەتییەکان ناپرسنەوە. هەرگیز لێت ناپرسن: "نەزمی دەنگی چۆنە؟" "زیاتر حەز لە چ یارییەک دەکات؟" "پەپوولە کۆ دەکاتەوە یان نا؟" بەڵکە لێت دەپرسن: "تەمەنی چەندە؟" "چەند برای هەیە؟" "قورساییەکەی چەندە؟" "مووچەی مانگانەی باوکی چەندە؟" و دوای ئەم پرسیارانەش ئەوجا پێیانوایە برادەرەکەتیان ناسیوە. ئەگەر بە گەورەکان بڵێیت: خانوویەکی جوانیم بینی کە بە خشتی سووری کاڵ هەڵچنرابوو، بەر پەنجەرەکانی نوقمی گوڵەشەمدانی و سەربانەکەی پڕ لە کۆتر بوو... مەحاڵە بتوانن ئەوە بهێننە بەر چاوی خۆیان کە شێوەی ئەو خانووە چۆن بووە. ناچاریت پێیان بڵێیت: "خانوویەکم بینیوە سەدان هەزار زیاتری

لێ سەرف کراوە." ئەوجا دەنگیان بەرز دەکەنەوە: "ئای کە جوانە!" یان بۆ نموونە ئەگەر پێیان بڵێیت: "بەڵگەی بوونی شازادەچکۆل ئەوەیە کە قشتیلانە و خوێنشیرین بوو، پێدەکەنی و حەزی دەکرد بەرخێکی هەبێت. بەرخویستنیش باشترین بەڵگەی بوونی مرۆڤە." شان هەڵدەتەکێنن و وەکوو منالێک مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن! بەڵام ئەگەر پێیان بڵێیت: "ئەو ئەستێرۆکەیەی شازادەچکۆلی لێوە هات، ناوی «ب. ٦١٢»یە"، بێ چەند و چۆن بڕوات پێدەکەن و واز لە پرسینی هەزاران شتی دیکەیش دەهێنن. لێرەدا، نابێت لێیان دڵگیر بیت. منالان دەبێت لەگەڵ گەورەکاندا زۆر بە سەبر و تەحەممول بن.

بەڵام ئێمەمانان کە لە ژیان دەگەین، ژمارەکان هیچ گرنگییەکیان بۆ ئێمە نییە! من دەمتوانی سەرەتای ئەم چیرۆکە وەکوو سەرەتای کۆنەچیرۆکێک دەست پێ بکەم. دەمتوانی بڵێم: "هەبوو نەبوو،





شازادەچکۆڵێک هەبوو و لە ئەستێرەیەکدا دەژیا. ئەستێرەیەک کە تەنیا نەختێک لە خۆی گەورەتر بوو و شازادەش بۆ خۆی لە هاوڕێ و هاودەمێک دەگەڕا..." ئەوسا ئەوانەی کە لە مانای ژیان دەگەن، بەم چەشنە گێڕانەوەیە، چاکتر لە حەقیقەتی ڕووداوەکان دەگەیشتن.

ئاخر من حەز ناکەم هیچ کەس کتێبەکەم بە شێوەیەکی سەرپێیی بخوێنێتەوە. خوا دەزانێت کە بە گێڕانەوەی یادوەرییەکانم چ خەمێک دامدەگرێت. ئێستا خەریکە شەش ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێدەپەڕێت کە هاوڕێکەم بە خۆی و بەرخەکەیەوە ڕۆیشت و بە جێی هێشتم. منیش ئێستا کە هەوڵ دەدەم باسی ئەوتان بۆ بکەم، بۆ ئەوەیە فەرامۆشی نەکەم. فەرامۆشکردنی هاوڕێیەک شتێکی خۆش نییە. ئاخر دەزانن هەموو کەسێک هاوڕێی نییە. منیش دەتوانم وەک یەکێک لەو گەورانە بم کە تەنیا بیر لە ژمارەکان دەکەنەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو قەڵەم و تەباشیری ڕەنگاوڕەنگم کڕی. لەم تەمەنەشدا بۆ کەسێکی وەک من کە هیچ کارێکی تری نەکردووە بێجگە لە کێشانەوەی ئەو وێنانەی ماری بووا لە دەرەوە و لە ناوەوە پێشان دەدەن، - ئەویش لە تەمەنی شەش ساڵیدا- کارێکی بێمانایە دیسان ڕوو لە نیگارکێشان بکاتەوە! هەڵبەت هەوڵ دەدەم تا ئەو جێیەی لە توانامدا هەیە وێنەی ئەو بەباشی بکێشم، بەڵام لەوە دڵنیا نیم تا چەند لەم کارەمدا سەرکەوتوو دەبم. جارێک شازادەچکۆل لە وێنەکەدا گەورە دەردەچێت و جارێکیش زۆر بچکۆلە دەردەچێت. لە ڕەنگی جلوبەرگەکەشی هێندە دڵنیا نیم. چی بڵێم، هەروا بە مەزەندە کار دەکەم. ئەمەش لە هیچ باشترە. با

ئەوەش بڵـێم کـە لە پێـشـاندانی هـەندێ وردەکـاریشـدا بـە هـەڵەدا چووم. بەڵام دەکرێت لەم بارەیەوە لێم ببووریت. هاوڕێکەم لە ئاست هیچ شـیـکردنەوە و وەسـفکـردنێکدا ملـی نەدەدا. لەوانەیە مـنیـشـی وەک خـۆی هـاتبێتـە بەرچاو. بەڵام من هێندە بەختـەوەر نیم بتـوانم بەرخـێک لە پشت کـونەکـانی سندووقـێکەوە ببـینم. لەوەیە مـنیش کەمێک لە گەورەکان بچم. ئاخر منیش نەختێک پیر بووم.

٥

ڕۆژ بەڕۆژ شـتی ترم لـەمـەڕ ئـەسـتـێـرەکـەی و سـەفـەرەکـەیەوە بۆ دەردەکـــەوت، ئـەمـــانە وردە وردە دەردەکـــەوتن و لـە ئاکـــامـی وردەســەرنج و تێـڕوانینەکـانی ئەوەوە بوون. هـەر لەم ڕێگەیەشــەوە بوو کە ڕۆژی سێیـەم ڕووداوە تاڵەکەی درەختی «باوباب»م بەر گوێ کەوت.

ئەمـجـارەشـیـان هـەر لە سـۆنگەی بەرخـەکەوە بوو، چونکە لەپڕێکدا شازادەچکۆل، وەک ئەوەی زۆر بە گومان بێت، لێی پرسیم:

– بەرخ بنچکەگیاش دەخۆن، وانییە؟

– بەڵێ. وایە.

– ئای کە پێم خۆشە!

نەمـتوانـی لەوە بگەم بۆ گـرنگە ئەگەر بەرخ بـنچکەگیـا بخـۆن. بەڵام شازادەچکۆل هەڵیدایە و گوتی:

– کەواتە درەختی باوبابیش دەخۆن، ها؟

بۆ شازادەچکۆلم ڕوون کردەوە کە درەختی باوباب دەوەن نیین. درەختن و لە بینای کڵێساکانیش بەرزترن و ئەگەر گەلەفیلێکیش لەگەڵ خۆی ببات، ناتوانن تاقە باوابێکیش بخۆن.
شازادەچکۆل بە بیستنی گەلەفیلێک لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی:
– کەواتە دەبێت فیلەکان لەسەر یەک هەڵچنین.
بەڵام ژیرانە درێژەی پێدا:
– بەر لەوەی درەختی باوباب گەورە ببن، بچووکن!
– بێگومان! بەڵام بۆ دەتەوێت بەرخەکانت درەختی باوباب بخۆن؟



ئەو هەر ئەوەندە وەڵامی دایەوە: "جا ئێستا گوێ بگرە..."، بە چەشنێک ئەم قسەیەی کرد دەتوت کێشەکە لە ڕۆژی ڕوونیش ڕوونترە و منیش ناچار بۆ ئەوەی نهێنیی ئەو قسەیە هەڵبهێنم، ئەوەندەم بیر لێ کردووە، بەتەواوی سەرم پێوەی خەریک بوو.

له ڕاستیدا لەسەر ئەستێرەکەی شازادەچکۆلیش، وەک گشت ئەستێرەکانی تر، هەم گیای چاکی لێ دەڕوێت و هەم گیاکەڵە. یانی هەم تۆوی چاکی گژوگیای چاک و هەم تۆوی خراپی گیاکەڵە. بەڵام تۆوەکان نابینرێن. ئەوان نادیار له خاکدا دەخەون، تا ئەو ساتەی یەکێکیان حەز به بێداربوونەوە دەکات. ئەوجا خۆی دەکێشێتەوە و سەرەتا به نەختێک شەرمەوە چەکەرەیەکی نەرم و نیانی خۆی ڕووەو خۆر دەردەکات. جا ئەگەر لقی توور، یان گوڵەباغێک بێت وازی لێ دەهێنرێت تا بۆ خۆی گەورە بێت. بەڵام ئەگەر گیاکەڵە بێت، هەر که چاوت پێی کەوت، دەبێت له ڕەگەوه هەڵیبکێشیت. ئێستا، له ئەستێرەکەی شازادەچکۆلدا، گەلێک تۆوی ترسناک هەبوون ـ تۆوی درەختی باوباب. سەرلەبەری خاکی ئەستێرەکەی گرتبووەوە. ئەگەر هەر زوو فریای درەختی باوباب نەکەویت، ئیتر کار له کار ترازاوە: سەرانسەری ئەستێرەکە دادەگرێت و به ڕەگەکانی کون کونی دەکات. خۆ ئەگەر ئەستێرەکه زۆر بچووک و باوبابەکانیش زۆر بن ئەوە ئیتر ئەستێرەکە دەفەوتێنێت.

پاشان شازادەچکۆل پێی گوتم: «ئەمە بووە به خوویەک و هەموو بەیانییەک دوای خۆئامادەکردن، دەبێت خەریکی خاوێنکردنەوەی ئەستێرەکەت بیت. مرۆڤ هەر که توانی گوڵەباغ و باوباب له یەکتر جیا بکاتەوە – تا ئەو کاتەی بچووکن له یەکتری دەچن– دەبێت ڕیشەکێشیان بکات. ئەمە کارێکی تاقەتپڕوێنە، بەڵام هێندە قورسیش نییە."

ڕۆژێکیان ڕازیی کردم بەوەی کە هەوڵ بدەم بە شێوەیەکی

ڕێکوپێک وێنەیەکی چاکی درەختی باوباب بکێشمەوە تا منالآن بە بینینی ئەو وێنەیە لە ماڵەکەی مندا بۆیان دەربکەوێت لە ئاست ئەو درەختەدا دەبێت چی بکەن. گوتی: "ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان سەفەر بکەن، لەوانەیە بەکاریان بێت. هەندێک جار پشتگوێخستنی کارێک زیانێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام ئەگەر پشتگوێخستن پەیوەندی بە باوبابەوە بێت ئەوە ڕیسەکەت لێ دەبێتەوە خوری. من ئەستێرەیەک دەناسم کە تەوەزلێک تێیدا نیشتەجێ بوو. کابرای تەوەزل بۆ هەڵکەندنی سێ نەمامی باوباب هەر ئەمڕۆ نا سبەینێی دەکرد..."

من بە کەڵکوەرگرتن لە ڕێنماییەکانی شازادەچکۆل وێنەی ئەو



ئەستێرەیەم کێشاوە. قەت حەزم لە پەند و ئامۆژگاریکردن نییە. بەڵام لەمەڕ مەترسیی باوبابەکانەوە کەم گوتراوە و مەترسی لە ڕێگای ئەو کەسەدا زۆرە، کە لە ئەستێرۆکەیەکی وادا ون و سەرگەردان بێت. بۆیە ناچارم بۆ جارێک لە جاران واز لە خووی هەمیشەییم بهێنم و بڵێم: "منالینە! وریای باوبابەکان بن!" بۆ ئەوەی هاوڕێکانم لە مەترسییەک ئاگادار بکەمەوە، کە دەمێکی دوورودرێژ، بەبێ ئەوەی لێی بە ئاگا بین، هەڕەشەی لێ کردووین، لەبەر ئەوەیە هێندە خۆم بەم وێنەیەوە ماندوو کردووە. ئاگادارکردنەوەکە بایی ئەو زەحمەتەیە کە بۆ کێشانی ئەم وێنەیەم کێشاوە. ئێستا لەوانەیە لە خۆت بپرسیت: "ئەی بۆچی هیچ کام لە وێنەکانی ئەم کتێبە وەک وێنەی باوبابەکان بە هەیبەت نین؟" وەڵامەکەی گەلێک ئاسانە: "من هەوڵی خۆمم داوە، بەڵام نەمتوانیوە. کە وێنەی باوبابەکانم دەکێشا هەستێکم هەبوو کە ئەمیان پێویستییەکی بێ چەند و چۆن بوو."

٦

ئای شازادەچکۆل! بەم چەشنە بوو کە وردە وردە لە ژیانە خەفەتبارەکەت گەیشتم. زۆر جاران، تاقە سەرگەرمیت ڕوانین بوو لە جوانیی زەردەپەڕ. سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارەم بوو کە ئەمەیانم بۆ دەرکەوت، کاتێ پێت گوتم:

– زۆر حەز لە بینینی خۆرئاوابوون دەکەم. ناتوانین بچین لە

ئاوابوونی خۆر بڕوانین؟

– بەڵام دەبێت چاوەڕێ بین...

– چاوەڕێی چی؟

– دەبێت بوەستیت تا خۆر ئاوا دەبێت.

سەرەتا زۆر پێت سەیر بوو، دواتر لەبەرخۆتەوە دەستت بە پێکەنین کرد و پاشان گوتت:

– قەت ئەوەم بیر ناکەوێتەوە کە لە ماڵەکەی خۆمدا نیم!

دەزانیت، لەڕاستیدا ـ کاتێ لە ئەمریکا نیوەڕۆیە، لە فرەنسا، وەک هەموومان دەزانین، خۆر خەریکە ئاوا دەبێت؟



ئەوەندە بەسە بەپەلە خۆت بگەیەنیتە فرەنسا تا خۆرئاوابوونێک ببینیت. حەیف کە فرەنسا هێندە لێرەوە دوورە. بەڵام لە ئەستێرە بچووکەکەی تۆدا هەر هێندەت بەس بوو نەخێک کورسییەکەت بجووڵێنێت و کاتێک ئارەزووت لێ بوو، سەیری زەردەپەڕ بکەیت و تاموچێژی لێ ببینیت.

– ڕۆژێکیان چل و سێ جار سەیری خۆرئاوابوونم کرد.

پاش کەمێک بەردەوام بوویت:

– خۆت دەزانیت... کە خەم بەتەواوی دڵی مرۆڤ دادەگرێت، مرۆڤ حەز لە بینینی خۆرئاوابوون دەکات.

– ئەو ڕۆژە زۆر خەمبار بوویت، کە خۆر چل و سێ جار ئاوابوو؟

بەڵام شازادەچکۆڵ وەڵامی نەدامەوە.

٧

ڕۆژی پێنجەم، دیسان هەر لە قسە و باسی بەرخەوە نهێنییەکی تری ژیانی شازادەچکۆلم بۆ دەرکەوت. وەکوو ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ لە دڵی خۆیدا بیری لێ کردبێتەوە، یەکسەر و بەبێ هیچ پێشەکییەک لێی پرسیم:

– بەرخێک کە بنچک بخوات، گوڵیش دەخوات؟

– هەر شتێک بدۆزێتەوە، دەیخوا.

– تەنانەت ئەو گوڵانەی دڕکیشیان پێوەیە؟

– بەڵێ، تەنانەت ئەو گوڵانەی دڕکیشیان پێوەیە.
– کەواتە دڕکەکان چ سوودێکیان هەیە؟
من لە کوێم زانیبا! بێجگە لەوەش ئەو کاتە گەلێک سەرقاڵی کردنەوەی بڕغوویەکی فڕۆکەکەم بووم کە زۆر توند بەسترابوو و نەدەکرایەوە. گرفتم زۆر بوون، چونکە خەریک بوو بۆم دەردەکەوت کە چاککردنەوەی فڕۆکەکەم کارێکی هێندە ئاسان نییە و بێجگە لەوەش ئاوی خواردنەوەم خەریک بوو تەواو دەبوو، تەواو ترسم لێ نیشت.
– ئەی دڕکەکان چ سوودێکیان هەیە؟
شازادەچکۆل وازی نەدەهێنا، تا وەڵامی پرسیاری خۆی وەرنەگرتایەتەوە. من بە دەست بڕغووەکەوە گیرم خواردبوو و بە بێتاقەتییەوە وەڵامم دایەوە:
– دڕکەکان هیچ سوودێکیان نییە. ئەوان تەنیا نیشانەی ناجسنی گوڵەکانن.
– حای!
دوای تاوێک بێدەنگبوون بە تووڕەییەوە گوتی:
– من ئەم قسانەم بە گوێدا ناچن! گوڵەکان بێهێزن. ساویلکەن. هەوڵ دەدەن بە شێوەیەک لە شێوەکان خۆیان بپارێزن. ئەوان پێیانوایە بەو دڕکانەوە ترسناکن.
فزژەم نەکرد. ئەو کاتە وا بیرم دەکردەوە: "ئەگەر ئەم بڕغووە خوێڕییە هەروا لاساری بکات بە چەکوشەکەم تێی بەر دەبم." بەڵام شازادەچکۆڵ دیسان کلافەی بیرمی ئاڵۆسکاندەوە:
– تۆ پێتوایە کە گوڵەکان...

ـ نا، بێگومان نا! هیچ شتێکم لە بیر و خەیاڵدا نییە. هەر هێندە بوو کە بە یەکەم شتێک بە خەیاڵمدا هات وەڵامم دایتەوە. بڕوانە! من ئێستا بە شتێکی گرنگەوە خەریکم.

بە دوو چاوی مۆلەقەوە لێی ڕوانیم و گوتی:

– شتی گرنگ!

دەیبینیم کە چەکوشەکەم بە دەستەوەیە و پەنجەکانم بە گریس ڕەش بوون و بەسەر ماکینەیەکدا چەماومەتەوە، کە زۆر ناشیرین دەهاتە پێش چاوی ئەو.

– خەریکی وەک مرۆڤە گەورەکان دەدوێیت!

بە بیستنی ئەم قسەیە نەختێک هەستم بە شەرمەزاری کرد، بەڵام ئەو هەروا بێبەزییانە درێژەی بە قسەکانی دا:

– تۆ هەموو شتەکان تێک دەدەیت! تێکەڵ و پێکەڵیان دەکەیت!

زۆر تووڕە بوو. بە جۆرێک سەری ڕاوەشاند، کە قژە زێڕینەکەی بەدەم باوە دەشەکایەوە.

– من ئەستێرەیەک دەناسم کە پیاوێکی سوورفلی تێدا نیشتەجێیە. ئەو پیاوە تەنانەت بۆنی بە گوڵێکیشەوە نەکردووە. هەرگیز لە ئەستێرەیەکی نەڕوانیوە. قەت کەسێکی خۆشنەویستووە. بێجگە لە کۆکردنەوەی ژمارەکان هیچ کارێکی تری نەکردووە. ئەویش کتومت وەکوو تۆ لە بەری بەیانەوە تا بانگی شێوان هەر دووبارەی دەکاتەوە: "من مرۆڤێکی گرنگم! مرۆڤێکی گرنگ!" هەر دەزانێت ئەم شتانە بڵێت و خۆی فش بکاتەوە. بەڵام خەیاڵی خاوە، ئەو مرۆڤ نییە، کوارگە!

– چییە؟

– کوارگ!
له تووڕەییدا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو.
– ملیۆنان ساڵە گوڵەکان دڕک دروست دەکەن و سەرەڕای ئەمەش ملیۆنان ساڵە بەرخ، گوڵەکان دەخۆن و تۆش پێتوایە کە گرنگ نییە لەوە تێ بگەین کە بۆچی گوڵەکان خۆ بە دروستکردنی ئەو دڕکانەوە ماندوو دەکەن کە هیچ سوودێکیان بۆیان نییە، خۆیان ماندوو دەکەن! گوایا شەڕی نێوان بەرخ و گوڵ زۆر گرنگ نییە؟ گرنگە و زۆریش گرنگترە لە هەموو ئەو ژماردنانەی کابرایەکی گەورە و سورفل پێیانەوە خەریکە. ئەگەر من گوڵێک بناسم کە لە هەموو دنیادا تاک و بێهاوتا بێت، تەنیا لە ئەستێرەکەی مندا هەبێت و لە هیچ شوێنێکی تر نەڕوێت، بەرخێکیش، ڕۆژێک لە ڕۆژان، لە هیچی خۆڕایی و بێ ئەوەی بزانێت خەریکە چی دەکات قەپی پێدا بکات ـ یانی ئەمە گرنگ نییە!
ڕوومەتەکانی سوورتر بووبوونەوە و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
ـ ئەگەر کەسێک گوڵێکی خۆش بوویێت کە لە ملیۆنان ئەستێرەدا تەنیا یەک گوڵی لەو چەشنە هەبێت و ئەوا ئەو کەسە هەر هێندەی بەسە کە لە ئەستێرەکان بڕوانێت و هەست بە بەختەوەری بکات دەتوانێت بە خۆی بڵێت: "گوڵەکەی من لە یەکێک لەو ئەستێرانەدایە..." بەڵام ئەگەر بەرخێک بێت و گوڵەکەی بخوات، وەک ئەوە وایە هەموو ئەستێرەکان لەپڕێکدا پرتەیەک بکەن و بکوژێنەوە. ئەمە گرنگ نییە؟
لەوە زیاتر نەیتوانی درێژە بە قسەکەی بدات و لە پرمەی گریانی دا. ئیتر شەو داهاتبوو. ئامرازەکانم لە لایەکەوە دانان. گوێم بە

چەکوش و برغووەکەم و هەروەها بە تینوویِتی و مردنیشم نەدا. لەسەر ئەستێرەکەی من، لەسەر گۆی زەوی، شازادەچکۆلەیەک هەبوو کە پێویستی بە دڵدانەوە بوو. لە باوەشم گرت و لاواندمەوە: "ئەو گوڵە هیچ مەترسییەکی لەسەر نییە، تۆ کە هێندە خۆشت دەوێت... من خۆم دەمبێنێک بۆ بەرخەکەت دەکێشمەوە... پەرژینێک بۆ گوڵەکەت دەکێشمەوە... من خۆم..." نەمزانی لەوە زیاتر چی بڵێم. خۆم گەلێک دەست و پێ سپی دەهاتە بەرچاو و نەمدەزانی بە چ شێوەیەک بەردەوام بم و وای لێ بکەم گوێ بگرێت. چ هەوارێکی پڕ لە ڕاز و نهێنییە هەواری فرمێسک!





## ٨

هەر زوو زانیاریی زیاترم لەبارەی ئەو گوڵەوە دەستکەوت. لە ئەستێرەکەی شازادەچکۆلدا هەمیشە کۆمەڵێک گوڵی سادە و ساکار، ئەو گوڵانەی کە تەنیا چەند پەڕەگوڵێکیان پێوەیە، ئەو گوڵانەی کە نە شوێنێکی ئەوتۆ دەگرن و نە بەر دەست و پێی کەسیش دەگرن، هەبوون. ئەو گوڵانە بەیانییەک لە بەیانیان سەریان لەناو گژوگیادا هەڵهێناوە و سەر لە ئێوارەش سیس هەڵگەڕاون. بەڵام گوڵەکەی شازادەچکۆل، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە تۆوێکەوە چەکەرەی کرد، کە کەس نەیدەزانی لە کوێوە هاتبوو و شازادەچکۆلیش بە وردی لەو چەکەرەیە ورد بووبووەوە کە مینا هیچ چەکەرەیەکی تر نەبوو. دوور نەبوو ئەمەشیان جۆرێکی تر لە باوبابەکان بووبێت، بەڵام بنچکەکە خێرا لە هەڵچوون وەستا و وەکوو گوڵێک خۆی نواند. شازادەچکۆل کە ئەوسا لە لای ئەو گوڵەوە ڕاوەستابوو و پشکوتنی ئەو چەکەرە گەورەیەی دەبینی، بە دڵیدا هاتبوو کە دەبێت شتێکی جوان و ناوازەی لێ بڕوێت. گوڵەکەش لەنێو خەوگە سەوزەکەیدا خەریکی خۆڕازاندنەوە و خۆنواندن بوو. ڕەنگەکانی خۆی بە وەسواسەوە هەڵبژارد، بە هێمنی و لەسەرخۆ جلوبەرگی پۆشی و یەک لە دوای



یەک پەڕەگوڵەکانی خۆی ڕێکخست. نەیدەویست مینا گولاڵەسوورەیەکی چرچ و لۆچ پەڕەکانی بکرێنەوە. هەر لە دەستپێکدا ویستی لەوپەڕی جوانی و شەنگیدا خۆی بنوێنێت. بەڵێ، لەڕاستیشدا نازدارێکی تەواو بە نازونووز بوو! ڕۆژان تێپەڕین و ئەویش هەر خەریکی خۆڕازاندنەوە پڕ لە ڕاز و نهێنییەکەی خۆی بوو. تا لە ئاکامدا بەربەیانێک، ڕێک لەگەڵ کازیوەدا، خۆی کردەوە.

سەرەڕای ئەوەی زۆر بە خۆخەملاندنەوە خەریک بووبوو، بەدەم باوێشکەوە گوتی:



– وەیش، هێشتا خەو بەری نەداوم! ببوورە کە هێشتا قژم بژ و ژاکاوە...

شازادەچکۆل خۆی پێڕانەگیرا ستایشی نەکات:

– وای کە چەند جوانیت!

گوڵ بە نەرمییەوە گوتی:

– توخوا وا نییە! من لەو کاتەدا چاوم بە ژین هەڵهێنا کە خۆر خەریک بوو...

شازادەچکۆل هەر زوو بۆی دەرکەوت کە ئەمەیان گوڵێکی هێندە شەرمن نییە، بەڵام بەڕاستی شاگەشکەهێنەر بوو!

– وا بزانم کاتی بەرچاییە. خۆ لە بیری ناکەیت کە...
شازادەچکۆل، تەواو سەری سوورِ ما و، بە پەلە چوو ئاوپرژێنێکی پرِ لە ئاوی ساردی بۆ هێنا.
بەو شێوەیە، هەر لە سەرەتاوە، بە لەخۆرِازیبوونە پەنهانەکەی، شازادەچکۆلی دڵگران کردبوو. رِۆژێکیان کە خەریک بوو لەمەرِ چوار درِکەکەیەوە قسەی دەکرد لەناکاو گوتی:
– دەبا پڵنگەکان بە چنگە تیژەکانیانەوە بێنە سەرم!
شازادەچکۆل لە ئاست ئەو قسەیەیدا گوتی:
– ئەستێرەکەی من پڵنگی تێدا نییە. بێجگە لەوەش پڵنگ گیا ناخۆن.
گوڵ بە نەرمییەکەوە گوتی:
– جا خۆ من گیا نیم.
– ببوورە کە...
– من لە پڵنگ نا، بەڵام لە هەڵکردنی با دەترسێم. دەتوانی شووشەبەندێکم بۆ بکەیت؟
شازادەچکۆل بیری کردەوە: "ترس لە هەڵکردنی با... ئەمە بۆ گوڵێک هیچ مەترسییەکی نییە."
"چەندە بە پێچ و پەنایە ئەم گوڵە!"
– دەبێت ئێواران بمخەیتە ژێر شووشەبەندێکەوە. ئێرە زۆر ساردە. هیچ شتێکی تێدا رِێک نەخراوە. لە شوێنەکەی جارانمدا...



لێرەدا قسـەکـەی بە خـۆی بڕی. ئاخـر ئەو کـە هاتبـوو تۆوێک بوو و هـیـچی تر نا. مـەحـاڵ بوو دنـیـایەکی دیکەی ناسـیـبێت. شـەرمـەزار



لەوەی لـەسـەر درۆیەکی ئاوا منـاڵانە پێـوە بووبوو، دوو سـێ جـار کـۆکـی، تا شـازادەچکۆل هەست بـەوە بکات کـە چ ناهـەقـیـیـەکی بەرانبەر کراوە و لە شەرمەزاریدا ئەوە بکات کە ئەو داوای کرد:
– باشە، کوا شووشەبەندەکە؟
– بە تەما بووم بڕۆم بیهێنم، بەڵام تۆ قسەت بەسەردا هێنا!
ئـەوسـا چەند جـارێکی تریش کـۆکـی، تا شـازادە هـەست بە کەمتەرخەمیی خۆی بکات.
بەم چەشنە بوو کـە شـازادەچکۆل سـەرەڕای ئەو دڵپـاکـیـیـەی لە ئەڤـینیـیـەوە بۆ ئەو گـوڵە هەڵدەقوڵا لێی کـەوتە گومـانەوە. قـسـە بێسەروبەرەکـانی ئەوی بە جیددی وەرگرتبـوو و گەلێک هـەسـتی بە بەدبەختیی خۆی کرد.

ڕۆژێکیـــان بە بڕوایەکی تەواوەوە پێی گـــوتم: "دەبوو گـــوێم لە قسەکانی نەگرتبا. مرۆڤ هەرگیز نابێت گوێ لە قسەی گوڵان بگرێت. دەبێت سەیریان بکەیت و بۆنیان پێوە بکەیت. گوڵەکەم سەرانسەری ئەستێرەکەمی پڕ کردبوو لە بۆن و بەرامەی خۆی، بەڵام من بە هیچ جۆرێک نەمتوانی چێژی لێ وەربگرم. چیرۆکی چڕنووکی پڵنگەکان، کە گەلێک بێتاقەتی کردبووم، دەبوو بەپێچەوانەوە دڵی نەرم کردبام..."

ڕۆژێکی تریش، هەر بە هەمان بڕوا و متمانەوە، پێی گوتم: "ئەوسا لە هیچ نەگەیشتم. من دەبوو لە ڕووی هەڵسووکەوتییەوە هەڵمسەنگاندبا نەک لە ڕووی قسەکانیەوە. ئەو منی سەرڕێژی بۆن و بەرامەی خۆی کرد بوو و دەوروبەری ڕووناک کردبوومەوە. دەبوو سەری خۆم هەڵنەگرتبایە و بە جێم نەهێشتبا. دەبوو هەستم بەو سۆز و نەرمونیانییەی کردبا کە لە پشت فێڵە بێگوناهەکانیەوە حەشار درابوون. گوڵان پڕن لەم چەشنە هاودژییانە. بەڵام چی بکەم، من لەوە کاڵفامتر بووم کە بزانم چۆن ئەوم خۆش بووێت."



پێموایە شازادەچکۆل، بۆ دەربازبوون لە ئەستێرەکەی، کەڵکی لە پۆلە باڵندەیەکی کۆچەر وەرگرت. سەرلەبەیانی بەر لە گەشتکردنەکەی، هەموو شتێکی سەر ئەستێرەکەی ڕێکوپێک کرد و پاک و خاوێنی کردەوە. بە جوانی دووکەڵی ئەو گڕکانانەی سڕییەوە، کە هێشتا گڕیان لێ بەرز دەبووەوە: دوو گڕکانی کارای هەبوو. بۆ ئامادەکردنی بەرچایی زۆر لەبار بوون و کەڵکی لێ وەردەگرتن. گڕکانێکی خامۆشیشی هەبوو. بەڵام، خۆی گوتەنی: "خۆ مرۆڤ بەری دەستی خۆی نەخوێندۆتەوە!" بۆیە ئەویشی خاوێن کردەوە. ئەگەر گڕکان پاک و خاوێن بن چاکتر دادەگیرسێن و لەناکاو کلّپە ناکەن. گڕی گڕکانیش مینا گڕی کوانوو لەناکاو هەڵدەچێت. هەڵبەت ئێمە لەسەر زەوی، لەوە بچووکترین گڕکانەکانمان پاک و خاوێن بکەینەوە و دووکەڵیان بسڕینەوە. هەربۆیەش هەندێک جار ناخۆشی و بەڵامان بەسەردا دەهێنن.
شازادەچکۆڵ بە دڵێکی پڕەوە، دوا نەمامە باوبابەکانیشی هەڵکێشا. پێیوابوو کە هەرگیز ناگەڕێتەوە، هەربۆیە کارە ئاساییەکانی ئەو بەیانییەی پڕ بە دڵ و بە شێوەیەکی تایبەت بە ئەنجام گەیاند. کە بۆ دوایین جار گوڵەکەی ئاو دا و خەریک بوو شووشەبەندەکەی بەسەردا بدات، هێندەی نەمابوو لە پڕمەی گریان بدا.
بە گوڵەکەی گوت: "ئیتر خوات لەگەڵ و ماڵ ئاوا."
گوڵ وەڵامی نەدایەوە.
دیسان گوتی: "ماڵ ئاوا!"

گوڵ کۆکـەیەکی کرد. بەڵام لەبەر ئەوە نەبوو کە سـەرمـای بوو. لە دواییندا گـوتـی: "مـن کـاڵفـام بووم و نـابەجێ ڕەفـتـارم لـەگـەڵدا کردیت. داوای لێبووردنت لێ دەکەم. هەوڵ بدە بەختەوەر بیت."

شـازادە پێی سـەیر بوو وەک هەمیـشـە نەکەوتە بەر پلار و لاتاوی گوڵەکە. حـەپەساو لە ئاست گوڵەکەدا وەستا و شـووشـەبەندەکەشـی هەر بە دەسـتـەوە بوو و سـەری لەم دڵنەوایی و ئاسـوودەییـەی نێوانیان دەرنەدەچوو.

گوڵ پێـیگوت: "خـۆشـم دەوێیت. خـەتای خـۆمـە، ئەگـەر هـەسـتـت بە خۆشەویستیم نەکردبێت. قـەیناکا، گرنگ نییە. بەڵام تۆش وەک من کـاڵفـام بوویت. هـەوڵ بـدە بەخـتـەوەر بـیت... ئەو شـووشـەبەندەش وەلانێ. چیتر پێویستیم پێی نییە.

– ئاخر «با»...

– هێندە سـەرمـام نـەبووە... شنـەی شـەوبا چاکم دەکـاتـەوە. بە ناخێری، گوڵم.

– ئەی گیانلەبەرەکان...

– ئەگـەر بمەوێت ببـمـە ئاشنای پەپوولەکـان، نـاچارم لەگـەڵ چەند کرمێکیـشـدا هەڵبکەم. پەپوولەکان زۆر جـوانن. بێـجگە لەوان کێ دێتـە سـەردانم؟ تۆ دوور دەڕۆیت. هیـچ تـرسـێکیـشـم لە گیـانلەبەرە دڕندەکان نییە: منیش خاوەنی چنگ و چڕنووکی خۆمم.

ئەوسا بە خۆشباوەڕییەوە چوار دڕکەکەی خۆی نیشان دا و گوتی:

– دڵ لە دڵ مـەدە و بەو شـێـوەیە خـۆت خـافڵ مـەکـە. ئێـسـتـا کـە بڕیارت داوە بڕۆیت، بڕۆ!

گـوڵێکی هێندە خـۆبەزلزان بوو، نـەیدەویست شـازادەچکۆل فرمێسکەکانی ببینێت.

لە نزیک ئەستێرۆکەکانی ٣٢٥ و ٣٢٦ و ٣٢٧ و ٣٢٨ و ٣٢٩ و ٣٣٠ دا ژیابوو. لەبەر ئەوەش بوو کە هەم بۆ خۆخافڵاندن و هەم بۆ فێربوون سەردانی ئەو ئەستیرۆکانەی کردبوو.
لە ئەستێرەی یەکەمیاندا پاشایەک دەژیا. بە کەوایەکی مەخمەڵی ئەرخەوانییەوە لەسەر تەختێکی سادە بەڵام شکۆدار، دانیشتبوو و هەر کە چاوی بە شازادەچکۆل کەوت هاواری کرد:
- ئەها، ئەمەش رەعیەت!
شازادەچکۆل بیری کردەوە: "جا کە هەرگیز لەوەوبەر نەیبینیوم چۆن دەزانێت من کێم!"
ئاخر ئەو نەیدەزانی دنیای پاشاکان گەلێک سادەیە و هەموو کەسێک بە رەعیەتی خۆیان دەزانن.
پاشا کە بینی سەرەنجام بۆتە پاشای کەسێک و لە خۆشیان نەیدەزانی چی بکات گوتی:
- وەرە پێشەوە، تا باشتر بتبینم!
شازادەچکۆل چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا تا شوێنێک بۆ دانیشتن بدۆزێتەوە، بەڵام کەوا نەخشین و کەشوفشەکەی پاشا هەموو ئەستێرەکەی داپۆشیبوو. بە ناچاری هەر بە پێوە وەستا و چونکە زۆر ماندوو بوو کەوتە باوێشکدان.
پاشا گوتی: "باوێشکدان لە حزووری پاشادا دژ بە ڕێورەسمی دەرباری شاهانەیە. چیتر بۆت نییە ئەم کارە بکەیت."
شازادەچکۆڵ بە شەرمەوە گوتی:

– ناتوانم بەری ئەم کـــارەم بگرم، چونکە لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووم و دەمێکە نەخەوتووم...
پاشـا گوتی: "باشــە، باشــە. کەواتە ئەمـر دەکەم باوێشـک بدەیت. چەندین ساڵە هیچ کەسێکم نەبینیوە باوێشک بدات و ئەمەش بۆ من شـتێکی سەیرە. دەی بزانم! جارێکی دی باوێشک بدە! ئەمـە فەرمانە و سەرپێچی لێ ناکرێت!"
ڕوومـەتەکانی شازادەچکۆل سوور هەڵگەڕان و دەمی کەوتە تەتەڵە و گوتی:
– ئاخر ترسام... ئیتر ناتوانم.
پاشـا گوتی: "ئەها! کەواتە من فـەرمـانت پێ دەدەم هەندێک جـار باوێشک بدەیت و هەندێک جاریش...
بە پەلە و تێکەڵ و پێکەڵ دەدوا. وێدەچوو تووڕە بووبێت.
پاشــا بەتوندی پابەندی ئەوە بوو کــە ڕێز لە توانا و دەســەڵاتی بگیـرێت. سەرپێـچی و نافـەرمانی هیچ کەسێکیشی پێ قـەبووڵ نەدەکرا. پاشایەکی موتڵـەق بوو. بەڵام چونکە هاوکاتیش مرۆڤێکی باش بوو، فەرمانەکانیشی نابەجێ نەبوون و گوتی:
– سەیرکە، ئەگـەر من فـەرمـان بە یەکێک لە سەرکردەکـانم بدەم ببـێت بە مەلێکی ڕاوکەری دەریا و کـەنارەکـان و ئەویش ملکەچی فەرمانەکەم نەبێت، ئەوە خەتای ئەوە، یان خەتای خۆمە؟!
شازادەچکۆل بەشەرمەوە پرسی:
– بۆم هەیە دانیشم؟
پاشا بە شان و شکۆیەکی تەواوە چمکێکی کەواکەی هەڵکێشا و گوتی:
– ئەمر دەکەم دانیشیت.

بەڵام شازادەچکۆل سەری لێ شێوابوو. ئەستێرەکەی پاشا زۆر بچووک بوو. ئاخر ئەو کابرایە پاشایەتی بەسەر چیدا دەکرد؟
شازادەچکۆل گوتی:
– قوربان، بمبەخشە کە دەپرسم...
پاشا بە پەلە گوتی:
– ئەمر دەکەم پرسیارم لێ بکەیت.
– قوربان... ئێوە پاشایەتی بەسەر چیدا دەکەن؟
پاشا بەهێمنی و لەسەرخۆ گوتی:
– بەسەر هەموو شتێکدا.
– هەموو شتێک؟
پاشا بە لێبڕاوییەوە ئاماژەی بۆ ئەستێرەکەی خۆی و ئەستێرە بچووک و گەورەکانی دەوروبەر کرد.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
– یانی بەسەر هەموو ئەمانەدا؟
پاشا وەڵامی دایەوە:
– بەڵێ بەسەر هەموو ئەمانەدا.
کەواتە ئەو پاشای تاکەئەستێرەیەک نەبوو، بەڵکوو پاشای سەرانسەری دنیا بوو.
– ئەستێرەکانیش بۆ جەنابتان دەست لەسەر سنگ وەستاون؟
پاشا گوتی:
– بێگومان. هەموویان گوێ لە مستی منن. من لە هیچ نافەرمانییەک نابوورم.
چەشنە دەسەڵاتێکی ئاوا، بەتەواوی شازادەچکۆلی شاگەشکە و



سەراسیمە کرد. ئەگەر شازادەش دەسەڵاتێکی ئاوای هەبا، ئەوا بێ ئەوەی تەنانەت پێویست بکات کورسییەکەشی بجوڵێنێت، دەیتوانی ڕۆژێ نەک تەنیا چلوسێ جار، بگرە حەفتاودوو جار و تەنانەت سەد جار و دووسەد جاریش خۆرئاوابوونی ببینیایە! جا چونکە هەستی بە خەمینی کرد سەبارەت بە ئەستێرە بەجێهێڵراوەکەی خۆی، پێی لە جەرگی خۆی نا کە داوایەک لە پاشا بکات:

– حەز دەکەم خۆرئاوابوونێک ببینم... لوتفێ بکەن و فەرمان بدەن خۆر ئاوا بێت.

– ئەگەر فەرمان بدەم سەرکردەیەکم وەکوو پەپوولە لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ بفڕێت، یان چیرۆکێکی پڕ لە سۆز و خەم بنووسێت، یان ببێتە مەلێکی ڕاوکەری دەریا و کەنارەکانی ئەویش نەتوانێت گوێڕایەڵی ئەو فەرمانە بێت، کاممان خەتابارین؟ من یان ئەو؟
شازادەچکۆل بێ سێ و دوو گوتی:
– تۆ!
پاشا بەردەوام بوو:
– ڕێک وایە! دەبێت لە هەرکەسێک ئەو داوایە بکرێت کە بتوانێت پێی هەڵسێت. دەسەڵات بەر لە هەموو شتێک دەبێت لەسەر ئەقڵ بەند بێت. ئەگەر تۆ فەرمان بە گەلەکەت بدەیت خۆیان بخەنە دەریاوە، ڕادەپەڕن و شۆڕش دەکەن. من بۆم هەیە خوازیاری بەجێهێنانی فەرمانەکانم بم، چونکە فەرمانەکانم گەلێک ئاقڵانەن.
شازادەچکۆل کە هەرکاتێ شتێکی پرسیبا تا وەڵامەکەی وەرنەگرتبا وازی نەدەهێنا گوتی:
– ئەی داخوازەکەی من لەمەڕ خۆرئاوابوون؟
– تۆش بە خۆرئاوابوونەکەت دەگەیت. ئەوەش جێبەجێ دەکەم. بەڵام من کە دەزانم دەسەڵات چۆن بەڕێوە دەبرێت، بیر لەوە دەکەمەوە چاوەڕوان بم، تا هەلومەرجی خۆرئاوابوون دێتە دی.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
– کەی ئەو هەلومەرجە دێتە دی؟
پاشا سەیری ڕۆژژمێرێکی قەبەی کرد و وەڵامی دایەوە:
– بەڵێ! بەڵێ! ئەو هەلومەرجە نزیکی... نزیکی سەعات حەوت و چل دەقیقەی ئێوارە دەبێت... ئەوسا خۆت دەبیینیت فەرمانەکەم چۆن بە جێ دەهێنرێت.

شازادەچکۆل باوێشکی دا. خەمبار بوو بەوەی کە دەبوو ئەوەندە چاوەڕوانی خۆرئاوابوونەکەی بێت. لە لایەکی تریشەوە هەستی کرد تەواو بێتاقەت بووە. بە پاشای گوت:

– ئیتر هیچ کارێکم لێرە نەماوە. ئێرەش بە جێ دەهێڵم و دەڕۆم!

پاشا کە شانازی بەوەوە دەکرد ڕەعیەتێکی هەیە، گوتی:

– نا، مەڕۆ! دەتکەم بە وەزیری خۆم!

– وەزیری چی؟

– وەزیری... وەزیری داد!

– ئاخر ئێرە هیچ کەسی تێدا نییە دادگایی بکرێت.

پاشا گوتی:

– تۆ چووزانی؟ خۆ من هێشتا بە هەموو لایەکی وڵاتەکەمدا نەگەڕاوم. من پیر بووم، شوێنی بەکارهێنانی گالیسکەم نییە و ڕۆیشتنیش زۆر ماندووم دەکات.

شازادەچکۆل کە داچەمابووەوە تا جارێکی دیکەش چاوێک بە دەوروبەری ئەستێرەکەدا بگێڕێت گوتی:

– تێدەگەم. چاک لەم دەوروبەرەم ڕوانیوە و، لەو ژێرەش کەسی لێ نییە.

پاشا وەڵامی دایەوە:

– باشە، کەواتە دەتوانیت خۆت دادگایی بکەیت. ئەمیان لە گشتیان سەختترە. خۆدادگاییکردن لە دادگاییکردنی خەڵک سەختترە. ئەگەر توانیت لەمەڕ خۆتەوە داوەری بکەیت ئەوا بەڕاستی زانایەکی گەورەیت.

شازادەچکۆل گوتی:

– من له هەر کوێیەک بم دەتوانم خۆم دادگایی بکەم، بۆ ئەوەش پێویست بەوە ناکات لێرە بمێنمەوە.
پاشا گوتی:
– بەڵێ! بەڵێ! دڵنیام جرجێکی پیر لە سووچێکی ئەستێرەکەمدا دەژی. شەوانە گوێم لە دەنگی دەبێت. دەتوانیت ئەو جرجە پیرە دادگایی بکەیت و جارناجارێکیش دەتوانیت حوکمی لەناوبردنی بدەیت. بەم چەشنە، ژیانی ئەو پەیوەندی بە دادپەروەریی تۆوە دەبێت. دەکرێت هەموو جارێکیش لێی ببووریت تا لە کیسمان نەچێت. ئاخر هەر ئەو جرجەمان هەیە.
شازادەچکۆل وەڵامی دایەوە:
– من حەزم لەوە نییە حوکمی لەناوبردنی هیچ کەسێک بدەم. هەربۆیەش ئیتر دەبێت بڕۆم.
پاشا گوتی:
– نا! مەڕۆ!
بەڵام شازادەچکۆل کە خۆی بۆ گەشتەکەی ئامادە کردبوو، حەزی نەکرد دڵی پاشا بشکێنێت، گوتی:
– ئەگەر جەنابی خاوەنشکۆتان حەز دەکەن هەموو فەرمانەکانتان جێبەجێ بکرێن، دەتوانن فەرمانێکی ژیرانە بەسەر مندا بکەن. بۆ نموونە دەتوانن فەرمان بدەن لە ماوەی یەک دەقیقەدا ئێرە بە جێ بهێڵم. وا بزانم هەلومەرجی ڕۆیشتنیش لەبارە...
کە شازادەچکۆل هیچ وەڵامێکی لە پاشا وەرنەگرتەوە، نەختێک کەوتە گومانەوە و پاشان ئاهێکی هەڵکێشا و وە ڕێ کەوت. ئەوسا پاشا بە پەلە هاواری کرد:

– دەتکەم بە سەفیری خۆم!
پاشا زۆر شکۆمەند دیار بوو.
شـــازادەچکۆل هەروا کـــە خـــەریک بوو دەڕۆیشت بیـــری کـــردەوە:
بەڕاستی گەورەکان سەیر و سەمەرەن!

## ١١

لە ئەستێرەی دووەمدا مرۆڤێکی خۆپەسند دەژیا.
خـــۆپەســـەند، هەر کـــە لە دوورەوە چاوی بە شـــازادەچکۆل کـــەوت، هاواری کرد:
– گیان! گیان! ئەوە ستایشکەرێک بەرەو ئێرە دێت!
ئاخر خۆپەسندەکان هەموو کەسێک بە ستایشکەر دەبینن.
شازادەچکۆل گوتی:
– سڵاو! کڵاوێکی چەند سەیرتان لە سەر ناوە!
خۆپەسند گوتی:
– بەم کـــڵاوە ســـڵاو دەکـــەم. مـــەبـــەســـتم ئەو کـــاتانەیە کـــە ســـتـــایش دەکرێم. هەرچەند بەداخەوە هیچ کەس بەم ناوەدا تێناپەڕێت.
شازادەچکۆل کە هیچ لە قسەکانی تێنەگەیشت، گوتی:
– ئۆهۆ!
خۆپەسند پێی گوت:
– چەپڵە لێ بدە.
شـــازادەچکۆل چەپڵـــەی لێـــدا و خـــۆپەسندیش بەئەدەبەوە خـــۆی چەماندەوە و کڵاوەکەی بەرز کردەوە.



شازادەچکۆل لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: "بینینی ئەمیان لە بینینی پاشا خۆشتر بوو."

دیسان کەوتە چەپڵەلێدان و خۆپەسندیش سەرلەنوێ خۆی چەماندەوە و کڵاوەکەی بەرز کردەوە.

شازادەچکۆل، دوای پێنج دەقیقە چەپڵەلێدان، لەم یارییە یەکلایەنییە ماندوو بوو، لێی پرسی:

– دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی کڵاوەکەت بەر بێتەوە؟

خۆپەسند قسەی شازادەی نەبیست. خۆپەسندان بێجگە لە ستایش هیچ شتێکی تر نابیسن.



له شازادەچکۆلی پرسی:

– ئەرێ بەڕاست، تۆ بە چاوی ستایشەوە سەیرم دەکەیت؟

– ستایش چییە؟

– یانی دانمان بەوەدا کە من قۆزترین، پۆشتە و پەرداخترین، دەوڵەمەندترین و ئاقڵترین پیاوی سەر ئەم ئەستێرەیەم.

– خۆ بێجگە لە تۆ کەسی تر لەم ئەستێرەیەدا نییە.

– قەیناکا تکایە ستایشم بکە!

شازادەچکۆل نەختێ شانی هەڵتەکاند و گوتی:

– باشە، ئەوە ستایشم کردیت. ئاخر ئەمە چ خۆشییەکی بۆ تۆ هەیە؟

پاشان شازادەچکۆل ملی ڕێگای گرتە بەر و هەروا کە خەریک بوو دەڕۆیشت بیری کردەوە: "بەڕاستی گەورەکان سەیر و سەمەرەن!"

## ١٢

لە ئەستێرەیەکی تردا مەینۆشێک دەژیا. ئەم دیدارەیان کورتخایەن بوو، بەڵام شازادەچکۆلی خستە خەمێکی قووڵەوە.
مەینۆشەکە بێدەنگ لە پشت ڕیزێک شووشەی پڕ و ڕیزێکی بەتاڵەوە دانیشتبوو. شازادەچکۆل ڕووی تێکرد و لێی پرسی:
– ئەوە خەریکی چییت؟
مەینۆش بە خەمبارییەوە گوتی:
– خەریکی مەیخواردنەوەم.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
– بۆچی مەی دەخۆیتەوە؟
مەینۆش وەڵامی دایەوە:
– تا بتوانم فەرامۆش بکەم.
شازادەچکۆل بە بەزەییەوە لێی پرسی:
– چی فەرامۆش بکەیت؟
مەینۆش سەری داخست و گوتی:
– شەرمەزاریم.
شازادەچکۆل، کە حەزی دەکرد یارمەتییەکی بدات، لێی پرسی:
– شەرمەزاری لە چی؟
مەینۆش وەڵامی دایەوە:
– شەرمەزاربوون لەوەی کە مەی دەخۆمەوە.
ئەمەی گوت و دیسان بێدەنگ بووەوە.
شازادەچکۆل بەحەپەساوییەوە ملی ڕێگای گرتە بەر و هەروا کە

خــــەریک بــوو دەڕۆیشــت بیـــری کـــردەوە: "بـەڕاســـتی و بـێ هیـچ چەندوچۆنێک گەورەکان سەیر و سەمەرەن!"

## ١٣

ئەستێرەی چوارەم، ئەستێرەی بازرگانێک بوو. ئەم کابرایە هێندە ســەرقــاڵ بوو کــە تـەنانـەت بە هـاتنی شــازادەچکۆلیش ســەری هەڵنەبڕی.
شازادەچکۆل گوتی:
- سلاو! جگەرەکەت کوژاوەتەوە.
- سێ و دوو دەکــاتە پێنج. پێنج و حــەوت دوانزدە. دوانـزە و سێ پانزدە. ســلاو. پانزدە و حـەوت بیـســتـودوو. بیـســتـودوو و شــەش دەکـاتە بیسـتوهـەشت. کـاتی داگیـرسـاندنەوەی جگەرەکـەمم نییـە. بیسـتوشـەش و پێنج، سیویەک. ئۆف! سەرجەمی دەکاتە پێنجسەد و یەک ملـیـۆن و شــەشــســەد و بیـســتـودوو هـەزار و حـەوتســەد و سیویەک.
- پێنجسەد ملیۆن چی؟
- ها! هێشتا لێرەیت؟ پێنجسەد و یەک ملـیۆن هـین... چووزانم، لە بیـرم چووەوە، ســەرم قـاڵە!... من مــرۆڤـێکی جـیــددیم و کـارم بە قسەی حەللەق و مەللەق نییە!... دوو و پێنج دەکاتە حەوت...
شــازادەچکۆل کــە قــەت وازی نـەدەهێنـا تـا وەڵامی پرســیــارێکی نەدرایەتەوە، لێی پرسییەوە:

– پێنجسەد و یەک ملیۆن چی؟
بازرگان سەری بەرز کردەوە:
– پەنجا و چوار ساڵ لەسەر ئەم ئەستێرەیە ژیاوم، لە سێ جار زیاتر تووشی گرفتی وا نەبووم بووبێتە هۆی هەڵەکردن لە کارەکەمدا. یەکەم جار بیست و دوو ساڵ بەر لە ئێستا: لەپڕێکدا قالۆنچەیەک لە ئاسمان بەربووەوە. ئەم ناوەی هەژاند و بوو بە هۆی ئەوەی لە کۆکردنەوەیەکدا چوار جار هەڵە بکەم. جاری دووەمیان یازدە ساڵ بەر لە ئێستا بوو کە باداریییەکەم لێی پیس کردم. من وەک پێویست وەرزش ناکەم و کاتی پیاسەکردنیشم نییە. من مرۆڤێکی جیددیم! جاری سێیەمیش ئێستایە... لە لایەن تۆوە! لە کوێ بووم! گەیشتمە کوێ! بەڵێ، پێنجسەد و یەک ملیۆن و...
– ئاخر پێنجسەد و یەک ملیۆن چی؟
بازرگان بۆی دەرکەوت، کە لە کۆڵی نابێتەوە. گوتی:



– ملیۆنان لەو شتە بچووکانەی جاروبار لە ئاسماندا دەبینرێن.
– مێش؟
– نە بابە مێشی چی؟! ئەو شتە بچووکانەی دەبریسکێنەوە.
– مێشهەنگوین؟
– کوڕە مێشهەنگوینی چی! ئەو شتە بچووکە زێڕینانەی کە مرۆڤە تەمەڵەکان تووشی خەیاڵات دەکەن. بەڵام من خۆم مرۆڤێکی جیددیم و هەرگیز کاتی خۆم بەم خەیاڵانەوە بە فیڕۆ نادەم.
– ئەها! ئەستێرە؟
– خۆیەتی: ئەستێرە!
– باشە تۆ پێنجسەد ملیۆن ئەستێرەت بۆ چییە، چییان لێ دەکەیت؟
– پێنجسەد و یەک ملیۆن و شەشسەد و بیستودوو هەزار و حەوتسەد و سیویەک. من مرۆڤێکی زۆر جیددی و وردکارم.
– دەی باشە، چی لەو ئەستێرانە دەکەیت؟
– چییان لێ دەکەم؟
– بەڵێ، چییان لێ دەکەیت؟
– هیچیان لێ ناکەم، دەبم بە خاوەنیان.
–خاوەنی ئەستێرەکان؟
– بەڵێ. خاوەنی ئەستێرەکان.
– بەڵام من هەر ئێستا پاشایەکم بینی کە...
– پاشاکان نابن بە خاوەنی شتەکان. ئەوان پاشایەتی بەسەر شتەکاندا دەکەن و ئەوەش شتێکی دیکەیە.
– دەی باشە، چ کەڵکێکی هەیە ببیت بە خاوەنیان، چییان لێ دەکەیت؟

- دەوڵەمەند دەبم.
- جا دەوڵەمەندبوون چ خۆشییەکی بۆ تۆ هەیە؟
- ئەگەر کەسێک ئەستێرەی دیکەی دۆزییەوە، دەتوانم لێی بکڕم.
شازادەچکۆل بیری کردەوە: "لۆژیکی ئەمیش نەختێک لە لۆژیکی کابرای مەینۆش دەچێت."
هەرچۆنێک بێت چەند پرسیارێکی دیکەیشی لێکرد:
- مرۆڤ چۆن دەبێت بە خاوەنی ئەستێرەکان؟
کابرای بازرگان بێ سێ و دوو و بە گرژییەوە پرسی:
- ئەم ئەستێرانە هی کێن؟
- چووزانم؟ هی هیچ کەس.
- کەواتە هی منن، چونکە من یەکەمین کەس بووم کە بیرم لێیان کردەوە.
- هەر ئەوەندە؟
- ئەی چی! ئەگەر تۆ گەوهەرێک بدۆزیتەوە کە هی هیچ کەس نەبێت، دەبێتە هی خۆت. ئەگەر دوورگەیەک بدۆزیتەوە کە هی هیچ کەس نەبێت دەبێتە دوورگەی خۆت. ئەگەر بەر لە کەسێکی تر بیرێک بە مێشکتدا بێت، بە ناوی خۆتەوە تۆماری دەکەیت و دەبیتە خاوەنی. هەربۆیەش بوومەتە خاوەنی ئەستێرەکان، چونکە هیچ کەس بەر لە من بیری لەوە نەکردۆتەوە ببێتە خاوەنیان.
شازادەچکۆل گوتی:
- قسەکانت هەمووی ڕاستن، بەڵام ئاخر چییان لێ دەکەیت؟
کابرای بازرگان گوتی:
- بەڕێوەیان دەبەم، دەیانژمێرم و دەیانژمێرمەوە. هەڵبەتە ئەمە

کارێکی سەختە، بەڵام من کارەکەمم بە جیددی وەرگرتووە.
شازادەچکۆل هێشتا قسەکانی کابرای بۆ نەسەلمێندرابوو و گوتی:
– ئەگەر من ملپێچێکی ئاوریشمیم هەبێت، دەتوانم لە ملمی بپێچم و لەگەڵ خۆمی ببەم. ئەگەر گوڵێکم هەبێت، دەتوانم بیچنم و بۆ هەر کوێ بمەوێت بیبەم. بەڵام خۆ تۆ ناتوانیت ئەستێرەکان دابگریت!
– نا. بەڵام دەتوانم بیانخەمە بانکەوە.
– یانی چی؟
– یانی ژمارەی ئەستێرەکانم لەسەر لەتەکاغەزێک دەنووسم و پاشان دەیانخەمە سندوقێکەوە و قفڵی دەدەم.
– هەر ئەمە؟
– ئەی چۆن. هەر ئەوەندەم بەسە!
شازادەچکۆل بیری کردەوە: "سەرنجڕاکێش و تەواو شاعیرانەیە، بەڵام مانایەکی ئەوتۆشی نییە."
ئاخر شازادەچکۆل لەبارەی ئەوەوە کە چ شتێک بێمانا و چ شتێک بەمانایە، بۆچوونێکی جیاواز لە تێگەیشتنی گەورەکانی هەبوو. دیسان ڕووی تێکرد و گوتی:
– من بەشی خۆمم هەیە، گوڵێکم هەیە کە هەموو ڕۆژێک ئاوی دەدەم. سێ گڕکانیشم هەن کە حەفتەی جارێک خاوێنیان دەکەمەوە. چونکە گڕکانە خامۆشەکەش خاوێن دەکەمەوە. مرۆڤ چووزانێ، لەوانەیە ئەویشیان ڕۆژێک گڕ بگرێت! ئەمە بۆ گڕکانەکان و بۆ گوڵەکەش بەکەڵکە و منیش خاوەنیانم. بەڵام تۆ هیچ کەڵکێکت بۆ ئەستێرەکان نییە.

کابرای بازرگان دەمی کردەوە، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە وەڵامی بداتەوە، شازادەچکۆلیش ملی ڕێگای گرتە بەر و هەروا کە خەریک بوو دەڕۆیشت بیری کردەوە: بەڕاستی گەورەکان هەر زۆر سەیر و سەمەرەن!

## ١٤

ئەستێرەی پێنجەم، ئەستێرەیەکی زۆر سەیر بوو. لە گشت ئەستێرەکانی تر بچووکتر بوو. سەرلەبەری تەنیا جێگای فانۆسێکی پێچکەدار و فانۆسوانێکی تێدا دەبووەوە. شازادەچکۆل سەری لەو نهێنییە دەرنەکرد، کە فانۆس و فانۆسوانێک لە سووچێکی ئاسماندا، لە ئەستێرەیەکدا کە نە ماڵێکی تێدایە و نە مرۆڤێک، چ حیکمەتێکی تێدایە. بەڵام بیری کردەوە: "وێدەچێت ئەم کابرایە تەختەیەکی نوقسان بێت. بەڵام هەرچۆنێک بێت، لە پاشا و کابرای خۆپەسند، لە مەینۆش و بازرگانەکە شێتتر نییە. هەر هیچ نەبێت کارەکەی ئەمیان مانایەکی هەیە. کە فانۆسەکەی دادەگیرسێنێت وەک ئەوەیە یارمەتی لەدایکبوونی ئەستێرەیەک، یان گوڵێک بدات و کاتێک خامۆشی دەکات، وەک ئەوەیە ئەستێرە یان گوڵەکە بخەوێنێت. ئەمە کارێکی جوانە و هەرشتێکیش جوان بێت، بێگومان پڕە لە مانا."
کە دابەزییە سەر ئەستێرەکە، بە ئەدەبەوە سڵاوی لە فانۆسوان کرد:
– ڕۆژ باش. بۆچی فانۆسەکەت دەکوژێنیتەوە؟

فانۆسوان وەڵامی دایەوە: "ئەمەیان دەستوورە."
– دەستووری چی؟
– دەستووری کوژاندنەوەی فانۆسەکە. ئێوارەتان شاد!
سەرلەنوێ فانۆسەکەی پێکرد.
– ئەی بۆچی دیسان پێت کردەوە؟
فانۆسوان وەڵامی دایەوە:
– دەستوورە، دەستوور!
شازادەچکۆل گوتی:
– هیچ تێناگەم.
فانۆسوان گوتی:
– تێگەیشتنی ناوێت، دەستوور دەستوورە. ڕۆژباش!
دیسان فانۆسەکەی کوژاندەوە.
پاشان بە دەستەسڕێکی سوور ئارەقەی نێوچەوانی سڕی و گوتی:
– ئەرکێکی قورسم لەسەر شانە. جاری جاران مانایەکی هەبوو. بەیانیان دەمکوژاندەوە و ئێوارانیش دامدەگیرساند. باقیی ڕۆژ دەحەسامەوە و باقیی شەویش لێی دەخەوتم...
– ئەی دواتر دەستوورەکە گۆڕا؟
فانۆسوان گوتی:
– دەستوورەکە نەگۆڕاوە، چەرمەسەری منیش هەر ئەمەیە. ساڵ دوای ساڵ خولانەوەی ئەم ئەستێرەیە خێراتر بووە و دەستوورەکەش هەر هەمان دەستووری جارانە.
– دەی، ئەوجا چییە؟
– ئێستا کە ئەم ئەستێرەیە دەقیقەی جارێک بە دەوری خۆیدا

دەخولێتەوە، ئیتر من بۆ چرکەیەکیش دەرفەتی پشوودانم نییە. لە دەقیقەیەکدا جارێک دایدەگیرسێنم و جارێکی تر دەیکوژێنمەوە.
- زۆر سەیرە! یانی درێژایی شەو و ڕۆژ لە ئەستێرەکەتدا لە دەقیقەیەک زیاتر نییە؟
فانۆسوان گوتی:
- هیچ سەیر نییە. ئێستا، من و تۆ، مانگێکی ڕێکە خەریکین پێکەوە دەدوێین.
- مانگێک؟
- بەڵێ. سی دەقیقە. سی ڕۆژ! ئێوارەت باش.
دیسان فانۆسەکەی پێکرد.
شازادەچکۆل سەیرێکی کرد، حەزی لە چارەی فانۆسوانەکە بوو، کە هێندە ڕێنمایی دەستوورەکانی دەکات. کەوتەوە بیری خۆرەتاو و زەردەپەڕ، کە جاری جاران لەڕێی وەرچەخاندنی کورسییەکەیەوە دەیتوانی بیانبینێ. ویستی یارمەتی هاوڕێکەی بدات:
- سەیرکە... من دەزانم چۆن هەر کاتێک ئارەزووت لێ بوو پشوو بدەیت...
فانۆسوان گوتی:
- لە خوام دەوێت.
بە واتایەکی دیکە مرۆڤ دەتوانێت هاوکات ڕێنمایی دەستووریش بکات و تەمبەڵییش بکات.
شازادەچکۆل درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی:
- ئەستێرەکەی تۆ هێندە بچووکە کە بە سێ هەنگاو دەتوانی بە دەوریدا بخولێیتەوە. تۆ دەتوانیت بە هێواشی هەنگاو هەڵهێنیت و



ـ ئیشەکەم زۆر ناخۆشە!

هەمیشەش لەبەر خۆرەتاو بیت. کەواتە هەر کاتێک ئارەزووی پشوودانت کرد، هەنگاوێک هەڵبێنەوە... بەم چەشنە هەرچەندت پێخۆش بێت ڕۆژ درێژ دەبێتەوە.

فانۆسوان گوتی:

- ئەم پێشنیارە دەوای دەردم ناکات. تاقە شتێک کە لە هەموو شتێکم خۆشتر دەوێت نووستنە.

شازادەچکۆل گوتی:

- کەواتە بەختمان یار نەبوو.

فانۆسوان گوتی:

- بەڵێ. هەرواشە. بەیانییت باش!

ئەوسا فانۆسەکەی کوژاندەوە.

شازادەچکۆل کە لەسەر گەشتەکەی خۆی بەردەوام بوو، بەدەم ڕێوە بیری کردەوە: "لەوانەیە لە دیدی هەموو ئەوانی ترەوە؛ پاشا، خۆپەسند، مەینۆش و بازرگان مایەی گاڵتەجاڕی بن، بەڵام ئەمیان تاقەکەسێکیانە کە شایانی گاڵتەپێکردن نییە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بێت کە ئەمیان هەر خەریکی خۆی نییە و کارێکیشی لە ئەستۆ گرتووە."

بە حەسرەتەوە ئاهێکی هەڵکێشا و بیری کردەوە:

- ئەمیان تاقەکەسێکیانە کە بمەوێت ببێت بە هاوڕێم. بەڵام ئەستێرەکەی هێندە بچووکە، شوێنی دوو کەسی تێدا نابێتەوە.

تاقەشتێک کە نەیدەوێرا تەنانەت بۆ خۆشی دانی پێدا بنێت، ئەوە بوو کە پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەو ئەستێرەیەدا بمێنێتەوە، لەوێ کە پیاو دەیتوانی لە شەووڕۆژێکدا هەزار و چوارسەد و چل جار خۆرئاوابوون ببینێت.

## ١٥

ئەستێرەی شەشەم، ئەستێرەیەک بوو دە بەرابەری ئەستێرەکانی تر. پیرەپیاوێکی تێدا نیشتەجێ بوو کە کتێبی قەبەی دەنووسین. هەر کە چاوی بە شازادەچکۆل کەوت، هاواری کرد:
- هەی گیان! ئەمەش گەڕیدەیەکی تر!
شازادەچکۆل لەسەر مێزەکە دانیشت و چونکە ڕێگایەکی دووری بڕیبوو کەوتبووە هەناسەبڕکێ.
پیرەمێردەکە لێی پرسی:
- لەکوێوە دێیت؟
شازادەچکۆل گوتی:
- ئەم کتێبە قەبەیە چییە؟ لێرە بە چییەوە خەریکیت؟
پیرەمێردەکە گوتی:
- من جوگرافیاناسم.
- جوگرافیاناس چییە؟
- جوگرافیاناس زانایەکە کە دەزانێت دەریاکان، ڕووبارەکان، شار و کێو و بیابانەکان لە کوێن و چۆن هەڵکەوتوون.
شازادەچکۆل گوتی: "ئەمەیان شتێکی گرنگ و سەرنجڕاکێشە. ئاخرییەکەی بە کارێکی ڕێکوپێک گەیشتم." سەیرێکی ئەملا و ئەولای ئەستێرەکەی کرد. قەت ئەستێرەی وا گەورەی نەبینیبوو.
- ئەستێرەکەت زۆر جوانە! ئۆقیانۆسیشی تێدایە؟
جوگرافیاناس گوتی:
- جا من چووزانم!



شازادەچکۆل گوتی:

– سەیرە! (شازادەچکۆل گەلێک بێئومێد بوو.) ئەی کێو؟

جوگرافیاناس گوتی:

– من چووزانم!

– ئەی شار، ڕووبار، بیابان؟

جوگرافیاناس گوتی:

– ئەوەش نازانم.

– ئەی تۆ جوگرافیاناس نیت!

جوگرافیاناس گوتی:

–ڕاستە. بەڵام من گەڕیدە نیم. من پێویستییەکی زۆرم بە گەڕیدەیەک هەیە. ئەوانەی شار و ڕووبار و کێو و دەریا و

ئۆقیانووس و بیابانەکان بەسەردەکەنەوە و دەیانژمێرن جوگرافیاناسان نین. جوگرافیاناس گەلێک لەوە گەورەترە کاتی ئەوەی هەبێت بە دنیادا بخولێتەوە و گەڕیدەیی بکات. ئەو قەت لە ژوورەکەی خۆی دەر ناکەوێت، بەڵام پێشوازی لە گەڕیدەکان دەکات. پرسیاریان لێ دەکات و ئەو شتانە دەنووسێتەوە کە ئەوان لە بیریان ماوە. جا ئەگەر بیرەوەریی یەکێکیانی بەلاوە گرنگ بوو، لە کەسایەتیی ئەو کەسە دەکۆڵێتەوە.

– لەپێناو چیدا؟

– چونکە ئەگەر گەڕیدەیەک درۆی کرد، یان ئەهلی مەیخواردنەوە بوو، کتێبەکانی جوگرافیا تووشی کارەسات دەبن.

شازادەچکۆل پرسی:

– مەیخواردنەوە؟

– چونکە سەرخۆش هەموو شتێک بە دووان دەبینێ. لەو حاڵەدا جوگرافیاناس دێت و لەباتی کێوێک دوو کێو دەنووسێت.

شازادەچکۆل گوتی:

– کەواتە من کابرایەک دەناسم کە لەوانەیە ببێتە گەڕیدەیەکی خراپ.

– دوور نییە. جا کە بۆمان دەرکەوێ ماستی کابرای گەڕیدە، هیچ موویەکی تێدا نییە، ئەوسا لە کەشفەکەی دەکۆڵینەوە.

– یانی دەڕۆن و شتەکان دەبینن؟

– نا. ئەو بێنە و بەردەیە زۆر دەکێشێت. دوایە داوا لە کابرای گەڕیدە دەکرێت بەڵگەکانی بخاتە ڕوو. بۆ نموونە ئەگەر لەمەڕ

کێوێکی مەزنەوە بدوێت، داوای لێ دەکرێت بەردێکی گەورە لەو کێوە بهێنێت.
جوگرافیاناس لەپڕێکدا بەپەرۆشەوە گوتی:
- ئەرێ بەڕاست خۆ تۆ لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتوویت! بێگومان گەڕیدەیت! دەبێت لەمەڕ ئەستێرەکەتەوە بۆم بدوێیت!
جوگرافیاناس، کە دەفتەرەکەی لە بەردەمیدا کرابووەوە، کەوتە دادانی قەڵەمەکەی. بیرەوەریی گەڕیدەکان، لە سەرەتادا، بە قەڵەم دەنووسرێنەوە و پاشان کە بەڵگەکان خرانە بەر دەست، بە مەرەکەب پاکنووس دەکرێن.
جوگرافیاناس گوتی: "دەی قسەم بۆ بکە."
شازادەچکۆل گوتی:
- ئەستێرەکەی من شتی هێندە سەرنجڕاکێشی تێدا نییە، لەوێ هەموو شتێک زۆر بچووکە. سێ گڕکانم هەن. دووانیان هێشتا دەگڕێن و ئەوی تریان خامۆشە. بەڵام مرۆڤ چووزانێت...
جوگرافیاناسیش گوتی:
- مرۆڤ چووزانێت چی دەقەومێت.
-گوڵێکیشم هەیە.
جوگرافیاناس گوتی:
- ئێمە لەمەڕ گەلا و گوڵەوە نانووسین.
- بۆ؟ خۆ ئەوە جوانترین گوڵە.
- چونکە گوڵ شتێکی «فانی»یە.
- فانی چییە؟
جوگرافیاناس گوتی:

– کتێبەکانی جوگرافیا لە گشت کتێبان بەنرخترن و قەت کۆن نابن. شتێکی گەلێک نائاسییە کە کێوێک شوێنگۆڕکێ بکات. بە دەگمەن ئاوی ئۆقیانۆسێک چک دەبێت. ئێمە تەنیا شتە ئەبەدییەکان دەنووسینەوە.
شازادەچکۆل قسەکەی پێ بڕی و گوتی:
– بەڵام لەوانەیە ڕۆژێک گڕکانە خامۆشەکان داگیرسێنەوە. دەی باشە نەتگوت «فانی» یانی چی؟
جوگرافیاناس گوتی:
– گڕکانەکان خامۆش بن یان داگیرساو، هیچ جیاوازییەکی بۆ ئێمە نییە. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە کێوەکانن، ئەوانیش هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت.
شازادەچکۆل کە هەرگیز وازی لە پرسینەوەی پرسیاری بێ وەڵام نەدەهێنا دیسان لێی پرسییەوە:
– فانی یانی چی؟
– یانی شتێک کە لە داهاتوودا بەرەو نەمان دەچێت.
– گوڵەکەی منیش لە داهاتوودا بەرەو نەمان دەچێت؟
– هەڵبەتە!
شازادەچکۆل بیری کردەوە: "گوڵەکەی من «فانی»یە و بۆ بەرگریکردن لە خۆی، لە چوار دڕک بەولاوە هیچی تری نییە. منیش بە تاقی تەنیا لە ئەستێرەکەی خۆمدا جێمهێشتووە."
ئەمە یەکەمین جار بوو هەست بە پەشیمانی بکات، بەڵام خێرا خۆی گورج کردەوە و لە کابرای جوگرافیاناسی پرسی:
– دەمەوێت بڕۆم بگەڕێم. بە ڕای تۆ ڕوو لە کوێ بکەم؟

جوگرافیاناس وەڵامی دایەوە:
– ئەستێرەی زەوی. ئەو ئەستێرەیە ناوبانگێکی چاکی هەیە...
شازادەچکۆلیش وە ڕێ کەوت و بیری لە گوڵەکەی دەکردەوە.

## ١٦

کەواتە، ئەستێرەی حەوتەم زەوی بوو.
زەوی، وەک هەر ئەستێرەیەکی دیکە نییە. لەسەر گۆی زەوی، مرۆڤ دەتوانێت هەتا سەدویانزدە پاشا (هەڵبەت بە لەبەرچاوگرتنی پاشا ڕەشپێستەکانیش)، حەوت هەزار جوگرافیاناس، نۆسەد هەزار بازرگان، حەوت ملیۆن و نیو مەینۆش و سێسەدویانزدە ملیۆن مرۆڤی خۆپەسند؛ بە واتایەکی تر نزیکەی دوو ملیارد مرۆڤی گەورە بژمێرێت.
بۆ ئەوەی شتێک لەبارەی گەورەیی زەوی تێ بگەن، دەرفەتم بدەن پێتان بڵێم کە بەر لە دۆزینەوەی وزەی کارەبا مرۆڤەکان ناچار بوون لەشکرێکی تەواو، لە هەر شەش کیشوەری زەویدا، لە چوارسەد و شەستودوو هەزار و پێنجسەد و یانزدە فانۆسوان تەیار بکەن.
بینینی ئەو فانۆسوانانە لە دوورەوە گەلێک جوان و سەرنجڕاکێش بوو. جووڵانەوەی فانۆسوانەکان مینا جووڵانەوەی سەماکەرانی ئۆپێرا، ڕێکوپێک بڕیاری لەسەر درابوو. بەر لە هەموویان سەرەی فانۆسوانەکانی نیوزلاند و ئوسترالیا بوو. ئەمان فانۆسە

ڕەنگینەکانی خۆیان پێ دەکرد و ئەوجا دەڕۆیشتن دەنووستن. لە جێگەی ئەوان سەرەی فانۆسوانەکانی چین و سیبیریا بوو بکەونە سەما. پاشان ئەوانیش دەچوونە پشت پەردەوە و شوێنیان بۆ فانۆسوانەکانی ڕوسیا و هیندستان چۆڵ دەکرد. دواتریش سەرەی فانۆسوانەکانی ئەفریقا و ئەوروپا و دوای ئەوانیش سەرەی فانۆسوانەکانی ئەمریکای خواروو و ئەمریکای سەروو بوو. هیچ کام لەمانەش لە هاتنە سەر تەختی شانۆ، تووشی هیچ هەڵەیەک نەدەبوون. بیری لێ بکەنەوە چ دیمەنێکی جوان بوو!

لەنێو ئەم فانۆسوانانەدا، تەنیا فانۆسوانەکەی تەوەری باکوور و هاوکارەکەی لە تەوەری باشوور، ژیانی ڕۆژانەیان بە بێکاری دەبردە سەر: ئاخر ئەوان لە ساڵێکدا تەنیا دوو جار کاریان دەکرد.

## ١٧

کە مرۆڤ زۆر بە پەلە بوو، ئەوەشی لێ دەقەومێت نەختێک درۆ بکات. منیش لە گێڕانەوەی سەرهاتی فانۆسوانەکاندا بەتەواوی ڕاستگۆ نەبووم. لەوەیە ئەوانەی کە گۆی زەوی ناناسن، وێنایەکی ناڕاستیان خرابێتە بەردەم. مرۆڤەکان بەشێکی زۆر کەمیان لەسەر پانتایی زەوی گرتووە. ئەگەر تێکڕای ئەو دوو ملیارد مرۆڤەی لەسەر گۆی زەوی دەژین هەستنە سەر پێ و وەک ئەو کاتەی لە کۆبوونەوەیەکدان لە تەنیشت یەکترەوە ڕاوەستن، بە ئاسانی لە مەیدانێکدا جێگەیان دەبێتەوە کە ڕووبەرەکەی بیست هەزار مەتری چوارگۆشە بێت. واتە دەکرێت هەموو مرۆڤەکانی

گۆی زەوی لە بچووکترین دوورگەی ئۆقیانۆسی ئارام بئاخنرێن.
هیچ گومانم لەوە نییە کە مرۆڤە گەورەکان بڕوا بەم قسەیەت ناکەن. ئاخر ئەوان پێیانوایە جێیەکی زۆر هەراویان گرتووە و هێندەی درەختی باوباب گەورە و گرنگن. پێیان بڵێ ژماردنێک بکەن. لە ئاست ئەم پێشنیارەدا لیکاو بە دەمیاندا دێتە خوار. بۆ؟ چونکە شەیدای ژمارە و پێوانن. بەڵام بۆ خاتری خوا تۆ کاتی خۆت بەم کارە بێکەڵکەوە بە فیڕۆ مەدە. ئەم کارە دوو قرووش ناهێنێت. ئاخر تۆ بڕوات بە قسەکانی من هەیە.
شازادەچکۆل کە پێی نایە سەر زەوی و هیچ بوونەوەرێکی نەبینی، حەپەسا. وردە وردە کەوتە سەر ئەو بیرەی کە بە هەڵە هاتووەتە ناو ئەستێرەیەکی دیکەوە، تا ئەو کاتەی ئەڵقەیەکی ڕەنگاوڕەنگ لەنێو لمەکەدا جووڵایەوە.
شازادەچکۆل هەروا شەوباشی لێکرد.
مار گوتی:
- شەوباش.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
- کەوتوومەتە سەر کام ئەستێرە؟
مار وەڵامی دایەوە:
- ئەستێرەی زەوی. کیشوەری ئەفریقا.
- ئەها! کەواتە گۆی زەوی مرۆڤی لێ نییە؟
مار گوتی:
- ئێرە سارایە. کەس لە سارادا ناژی. گۆی زەوی گەلێک پان و بەرینە.
شازادەچکۆل لەسەر بەردێک دانیشت و چاوی لە ئاسمان بڕی.

گوتی:
– له خۆم دەپرسم ئاخۆ ئەستێرەکان بۆ ئەوە دەدرەوشێنەوە تا هەرکەسێک کە ویستی بتوانێت ئەستێرەکەی خۆی بدۆزێتەوە! سەیری ئەستێرەکەم بکە! ڕێک لەسەر سەرمانە... بەڵام چەندیش دوورە!
مار گوتی:
– ئەستێرەکەت جوانە. دەتەوێت لێرە چی بکەیت؟
شازادەچکۆل گوتی:
– نێوانم لەگەڵ گوڵێک تێکچووە.
مار گوتی:
– ئەها!
هەردووکیان بێ دەنگ بوون.
دوای تاوێک، شازادەچکۆل گوتی:
– مرۆڤەکان لەکوێن؟ مرۆڤ لە سارادا نەختێک هەست بە تەنیایی دەکات...
مار گوتی:
– لەنێو مرۆڤەکانیشدا، هەست بە تەنیایی دەکەیت.
شازادەچکۆل ماوەیەکی درێژ سەیری کرد و دوایی گوتی:
– تۆ گیانلەبەرێکی سەیریت. وەکوو پەنجەیەک، باریکیت.
مار گوتی:
– بەڵام لە پەنجەی پاشایەک بەهێزترم.
شازادەچکۆل بزەیەکی هاتە سەر لێو و گوتی:
– واش نا... پێیشت نییە. تەنانەت ناتوانیت ڕێ بکەیت.



– تۆ گیانلەبەرێکی سەیریت، وەکوو پەنجەیەک، باریکیت.

– من دەتوانم بتبەمە شوێنی وا دوور، کە بە هیچ کەشتییەکیش ڕێت تێی نەکەوێت.
مار ئەمەی وت و وەکوو ئەڵقەیەکی زێڕین، خۆی لە پاژنەی شازادەچکۆل ئاڵاند و بەردەوام بوو:
– پەنجە بۆ هەرکەسێ بەرم دەینێرمەوە ژێر ئەو خاکەی لێیەوە هاتووە. بەڵام تۆ پاک و بێگوناهیت. لە ئەستێرەیەکی تریشەوە هاتوویت.
شازادەچکۆل وەڵامی نەدایەوە.
– تۆ لەسەر ئەم زەوییە وشک و ڕووتەنە هێندە بێهێزیت کە بەزەییم پێتدا دێتەوە. ئەگەر ڕۆژێک بیری ئەستێرەکەی خۆت کرد، وەرە لام، دەتوانم یارمەتیت بدەم... من دەتوانم...
شازادەچکۆل گوتی:
– تێگەیشتم. بەڵام بەڕاست، تۆ بۆچی وەکوو مەتەڵ قسە دەکەیت؟
مار گوتی:
– من هەڵهێنەری گشت مەتەڵەکانم.
ئەوسا هەردووکیان بێ دەنگ بوون.

## ١٨

شازادەچکۆل بەنێو سارادا کەوتە گەڕان و بێجگە لە تاقەگوڵێک هیچ شتی تری نەبینی: گوڵێکی سێپەڕە. گوڵێکی تەواو سادە و ساکار.

شازادەچکۆل گوتی:

– سڵاو.

گوڵ گوتی:

– سڵاو.

شازادەچکۆل بە ئەدەبەوە لێی پرسی:

– ئەی مرۆڤەکان لەکوێن؟

گوڵ، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان، کاروانێکی بینیبوو بەو سارایەدا تێپەڕیبوو، گوتی:

– مرۆڤەکان؟ وا بزانم شەش حەوتێکن. چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بینیمن. بەڵام خوا دەزانێت ئێستا لەکوێن؟ چونکە بێڕیشەن، «با» بەملا و بەولادا پرش و بڵاویان دەکاتەوە و بێڕیشەییش زیانێکی زۆری پێگەیاندوون.

شازادەچکۆل گوتی:

– خوات لەگەڵ.

گوڵ گوتی:

– خوات لەگەڵ.



# ١٩

به کێوێکی بەرزدا هەڵگەڕا. تا ئەو کاتە هیچ کێوێکی تری بێجگە لە سێ گڕکانەکانی خۆی، کە بەرزاییان دەگەیشتە ئەژنۆی، نەبینیبوو. گڕکانە خامۆشەکەشی وەکوو کورسی بە کار هێنابوو. شازادەچکۆل بیری کردەوە: "لەسەر کێوێکی ئاوها بەرز دەتوانم بە یەکجار گشت ئەستێرە و مرۆڤەکان ببینم.." بەڵام بێجگە لە تەوقەنەی تیژی کێوەکان، هیچ شتێکی تری نەبینی.



هەر لە خۆیەوە گوتی:

– سڵاو.

زایەڵەی دەنگی وەڵامی دایەوە:

– سڵاو... سڵاو... سڵاو...

شازادەچکۆل گوتی:

– ئێوە کێن؟

زایەڵە وەڵامی دایەوە:

– ئێوە کێن... ئێوە کێن... ئێوە کێن...

گوتی:

– دەتانەوێت ببن بە هاوڕێم؟ من تەنیام.

زایەڵە وەڵامی دایەوە:

– من تەنیام... من تەنیام... من تەنیام...

ئەوسا بیری کردەوە: "ئەستێرەیەکی چەند سەیرە! وشک و بڕنگ، تیژ تیژ و سوێر سوێر. مرۆڤەکانیشی تۆزقاڵێک فانتازیایان نییە و هەرشتێک ببیستن دەیڵێنەوە... لە ئەستێرەکەی خۆمدا گوڵێکم هەبوو هەمیشە ئەو بوو کە دەستی بە قسەکردن دەکرد..."

## ٢٠

دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ بەنێو لم و بەفر و چیاکاندا گەڕا، ڕێگایەکی دۆزییەوە. گشت ڕێگایەکانیش بەرەو مرۆڤەکان دەڕۆن.

گوتی:
- ڕۆژباش.
بەرانبەرەکەی گوڵجارێک بوو.
گوڵەباخەکان گوتیان:
- ڕۆژباش. شازادەچکۆل لێیان وردبووەوە. هەموویان لە گوڵەکەی ئەو دەچوون. بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسین:
- ئێوە کێن؟
گوتیان:
- ئێمە گوڵەباخین.
ئاخێکی هەڵکێشا و هەستی بە بەدبەختیی خۆی کرد. گوڵەکەی پێی وتبوو لە هەموو دنیادا تاکە و هیچ گوڵێکی تر نییە هاوچەشنی ئەو بێت. ئێستاش ئەوەتا لە گوڵجارێکدا پێنج هەزار گوڵی لە چەشنی ئەو هەبوو! لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەگەر گوڵەکەی من ئەمانەی بینیبا، چاک بە خۆیدا دەشکایەوە. دەستی بە کۆکەکۆکێکی خەتەرناک دەکرد و خۆی دەهێنایە حاڵی مردن بۆ ئەوەی خۆی لەو دەستخەڕۆییە قوتار بکات، منیش ناچار دەبووم وا نیشان بدەم کە خەریکی خزمەتکردنیم. دەنا هەر بۆ شەرمەزارکردنی منیش بووایە، خۆی لارەمل دەکرد و دەمرد..."
پاشان بیری کردەوە: "بەوەی کە خاوەنی گوڵێکی دەگمەن بووم، پێموابوو کە زۆر دەوڵەمەندم، کەچی ئەوەتا ئێستا تەنیا گوڵێکی ئاساییم هەیە. من بە گوڵێکی بەستەزمان و سێ گرکانەوە، کە بەرزاییان دەگاتە ئەژنۆم و یەکێکیشیان لەوانەیە تا دنیا دنیایە هەر بە خامۆشی بمێنێتەوە، خۆم بە شازادەیەکی مەزن دادەنا ـ

بەڵام نەخێر من شازادەیەکی مەزن نیم..." ئەوجا لەسەر سەوزەزارەکە پاڵکەوت و دەستی بە گریان کرد.



## ٢١

ڕێک لەو کاتەدا ڕێوی دەرکەوت.

ڕێوی گوتی:

- سڵاو.

شازادەچکۆل بەئەدەبەوە گوتی:

- سڵاو.

وەرچەرخا، بەڵام هیچ کەسی نەبینی.

دەنگەکە گوتی:

- من لێرەم، لەژێر دارسێوەکە...

شازادەچکۆل گوتی:

– تۆ کێیت؟ ئای کە ژیکەڵەیت...
ڕێوی گوتی:
– من ڕێویم.
شازادەچکۆل گوتی:
– وەرە یاریم لەگەڵدا بکە. دەزانیت چەندێ دڵتەنگم...
ڕێوی گوتی:
– من ناتوانم یاریت لەگەڵدا بکەم. ئاخر هێشتا منیان ماڵی نەکردووە.
شازادەچکۆل ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:
– ببوورە.
بەڵام دوای ئەوەی نەختێک بیری کردەوە و لێی پرسی:
– "ماڵیبوون"، یانی چی؟
ڕێوی گوتی:
– دیارە تۆ خەڵکی ئێرە نیت. لە چی دەگەڕێیت؟
شازادەچکۆل گوتی:
– لە مرۆڤەکان دەگەڕێم. نەتوت "ماڵی" یانی چی؟
ڕێوی گوتی:
– مرۆڤەکان تفەنگیان هەیە و ڕاو دەکەن. ئەمەیان شتێکی ناخۆشە! مریشک و پەلەوەریش بە خێو دەکەن. هەر بە تەنیا خەریکی ئەو شتەن. تۆ لە مریشک دەگەڕێیت؟
شازادەچکۆل گوتی:
– نا. من لە هاوڕێ دەگەڕێم. ماڵیبوون یانی چی؟
ڕێوی گوتی:

- ئەمە هونەرێکە دەمێکە فەرامۆش کراوە. ماڵیبوون یانی: "خووگرتن بە کەسێکەوە."
- خووگرتن بە کەسێکەوە؟
ڕێوی گوتی:
- بێگومان. تۆ ئێستا بۆ من کوڕیژکەیەکی وەک هەموو کوڕیژکەکانی تر. نە من هیچ پێویستییەکم بە تۆیە و نە تۆش هیچ پێویستییەکت بە منە. من بۆ تۆ ڕێوییەکم وەک سەدان هەزار ڕێوی تر. بەڵام ئەگەر ماڵیم بکەیت، ئەوسا هەردووکمان پێویستمان بە یەکتر دەبێت. من بۆ تۆ دەبمە تاقەڕێوییەک لە سەرانسەری دنیادا...
شازادەچکۆل گوتی:
- کەم کەم خەریکە تێدەگەم. گوڵێک هەیە... وا بزانم ئەو گوڵە منی ماڵی کردووە...
ڕێوی گوتی:
- لەوانەیە. لەسەر ئەم گۆی زەوییە هەزار شتی سەیروسەمەرە دەبینرێت.
شازادەچکۆل گوتی:
- لەسەر گۆی زەوی نییە.
ڕێوی کە دەیویست زیاتر حاڵی بێت گوتی:
- لە ئەستێرەیەکی تردایە؟
- بەڵێ.
- ئەو ئەستێرەیە ڕاوچیشی لێیە؟
- نا.

- گیان گیان! ئەمەیە شوێن! ئەی مریشک و پەلەوەری لێیە؟
- نا.
ڕێوی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:
- هیچ کارێک نییە تەگەرەی تێ نەکەوێت!
بەڵام درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی:
- ژیانێکی یەکلایەنە و نەگۆڕم هەیە. من ڕاوی مریشک و مرۆڤەکانیش من ڕاو دەکەن. مریشکەکان هەموویان یەک شێوەن و مرۆڤەکانیش گشتیان یەک چەشنن. ئەمە نەختێک بێتاقەتم دەکات. بەڵام ئەگەر تۆ ماڵیم بکەیت وەک ئەوە وایە کە ژیانم پڕ بکەیت لە ڕووناکی. ئەوسا ترپەی پێیەک دەناسمەوە کە لە ترپەی پێیەکانی تر جیایە. ترپەی پێیەکانی تر وام لێدەکەن کونە مشکم لێ ببێت بە قەیسەری، بەڵام ترپەی پێی تۆ وەکوو مۆسیقا دێتە بەر گوێم و لە کونەکەمەوە دەرم دەکێشێتە دەرەوە. جگە لەمەش، ئەو کێڵگەی دانەوێڵەیە دەبینیت؟ بۆ من کە نانخۆر نیم، دانەوێڵە هیچ خێروبێرێکی بۆ من نییە. کەواتە هیچ شتێکم بیر ناخاتەوە. ئەمەش ناخۆشە! بەڵام تۆ قژت لە زێڕ دەچێت. کەواتە ئەگەر ماڵیم بکەیت ژیانم تووشی گۆڕانێکی خۆش دەبێت! دانەوێڵەیش کە ڕەنگی لە زێڕ دەچێت، تۆم بیر دەخاتەوە و حەزم لە بیستنی گڤەی «با»ش دەبێت کە کەرویشکە بە پەلکەکانی دەکات...
تاوێ بێدەنگ بوو و ماوەیەکی درێژیش لە شازادەچکۆلی ڕوانی. ئەوسا گوتی:
- تکایە! ماڵیم بکە!
شازادەچکۆڵ وەڵامی دایەوە:

– زۆر حەز دەکەم، بەڵام کاتم نییە. دەبێت بڕۆم بۆ خۆم چەند هاوڕێیەک بدۆزمەوە و گەلێک شتیش هەن دەبێت تێیان بگەم.
ڕێوی گوتی:
– مرۆڤ تەنیا دەتوانێت لەو شتە بگات کە ماڵی دەکات. مرۆڤەکان کاتی خۆئاشناکردنیان بە هیچ شتێک نەماوە. هەموو شتێک بە حازری لە دوکانەکان دەکڕن. جا چونکە هیچ دوکانێکیش بۆ هاوڕێکڕین نییە، مرۆڤەکان هیچ هاوڕێیەکیان بۆ نەماوەتەوە. تۆ ئەگەر دەتەوێت هاوڕێیەکت هەبێت، فەرموو ماڵیم بکە!
شازادەچکۆل لێی پرسی:
– چۆن؟
ڕێوی وەڵامی دایەوە:
– دەبێت زۆر بە سەبر و تاقەت بیت. سەرەتا دەبێت نەختێک دوور لە من و لەنێو ئەو سەوزەگیایەدا دابنیشیت. من بە تیلەی چاو لێت دەڕوانم و تۆش ورتە ناکەیت. بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ دەتوانیت زیاتر لێم نزیک ببیتەوە.
بۆ سبەینێ شازادەچکۆل هاتەوە.
ڕێوی گوتی:
– سەد بریا، ڕێک لە کاتی دوێنێدا هاتبایت. بۆ نموونە، ئەگەر سەعات چواری پاشنیوەڕۆ بێیت، ئەوە لە سەعات «سێ»وە هەست بە بەختەوەری دەکەم و هەر کە هاتنت نزیکتر بێتەوە، من زیاتر هەست بە بەختەوەری دەکەم. کە سەعاتیش بوو بە چوار، ئەوە من تووشی دڵەکوتە و نیگەرانی دەبم و هەر ئەوساش نرخی بەختەوەری دەزانم! بەڵام ئەگەر تۆ وەخت و ناوەخت بێیت، چۆن

بزانم لە چ کاتێکدا دەبێت خۆم بۆ بینینت ئامادە بکەم؟... هەموو شتێک دەبێت ڕێورەسمی خۆی هەبێت.
شازادەچکۆل گوتی:
- ڕێورەسم چییە؟
ڕێوی گوتی:
- ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە بەتەواوی لە بیر کراوە. ڕێورەسم ئەو شتەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆژێک لەگەڵ ڕۆژەکانی تر و کاتێک لەگەڵ کاتەکانی تر جیاواز بێت. بۆ نموونە: ڕاوچییەکان لەنێو خۆیاندا ڕێورەسمی خۆیان هەیە. ئەوان پێنجشەممان دەچن لەگەڵ کچانی لادێدا سەما دەکەن. کەواتە پێنجشەممان ڕۆژی جەژن و سەیرانی منە: بۆ خۆم بە پیاسە تا دەوروبەری ڕەز و باخەکان دەڕۆم. ئەوجا بیری لێ بکەرەوە، ئەگەر ڕاوچییەکان وەخت و ناوەخت هەڵپەڕیبان، گشت ڕۆژەکان وەکوو یەک دەبوون و منی چارەڕەشیش کات و دەرفەتی پشوودانم نەدەبوو.
بەم شێوەیە، شازادەچکۆل توانی ڕێوییەکە ماڵی بکات.
کە ساتی جیابوونەوەش هات، ڕێوی گوتی:
- ئاخ! من ناتوانم بەری فرمێسکەکانم بگرم.
شازادەچکۆل گوتی:
- خەتای خۆتە. خۆ من هیچ نیازێکی خەراپم نەبوو. خۆت داوات کرد ماڵیت بکەم.
ڕێوی گوتی:
- بەڵێ ڕاستە.
شازادەچکۆل گوتی:



ـ بۆ نموونە، ئەگەر سەعات چواری پاشنیوەڕۆ بێیت، ئەوە لە سەعات «سێ»وە هەست بە بەختەوەری دەکەم...



– بەڵام تۆ خەریکیت دەگریت!

ڕێوی گوتی:

– بەڵێ ڕاستە.

– کەواتە ئەمە چ خۆشییەکی بۆ تۆ هەیە؟

ڕێوی گوتی:

– دڵخۆشتر دەبم کە ڕەنگی دانەوێڵە دەبینم.

پاشان گوتی:

– بڕۆ سەیرێکی گوڵەکان بکەرەوە تا بزانیت گوڵەکەی تۆ لە دنیادا، تاقانەیە. کە بۆ ماڵئاواییکردن گەڕایتەوە، ئەوسا بە یادگاری لێکدابڕان ڕازێکت بۆ دەدرکێنم.

شازادەچکۆل بە گوڵەکانی گوت:
– ئێوە لە گوڵەکەی من ناچن و هێشتا هیچ نین. هێشتا خووتان بە کەسێکەوە نەگرتووە. ئێوە وەک ڕێوییەکەی من وان، ئەویش وەکوو سەدان هەزار ڕێوی دیکە وا بوو. بەڵام من کردم بە هاوڕێی خۆم و ئێستا ئەو لە دیدی منەوە تاقەڕێوییەکە لە هەموو دنیادا.
گوڵەکان شەرم دایگرتبوون.
– ئێوە جوانن، بەڵام بەتاڵن. شازادەچکۆل لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو: پیاو ناتوانێت ژیانی خۆی بە ئێوە ببەخشێت. ڕەنگە گوڵەکەی منیش لە دیدی ڕێبوارێکەوە، گوڵێک بێت وەکوو ئێوە. بەڵام لە دیدی منەوە، گوڵەکەی من لە هەمووتان بەنرخترە. چونکە ئەو تەنیا گوڵێکە ئاوم داوە. چونکە تەنیا گوڵێکە خستوومەتە ژێر شووشەبەندێکەوە. چونکە تەنیا گوڵێکە لە کرمەکانیم پاک کردۆتەوە (بێجگە لە یەک دووانێکیان نەبێت کە دەبوون بە پەپوولە). چونکە ئەو تەنیا گوڵێکە سکاڵای خۆی بۆ کردووم یان خۆی لە ڕوومدا هەڵکێشاوە و نازی کردووە و تەنیا گوڵێکە کە هەندێک جاریش بێدەنگ بووە. چونکە ئەو گوڵی منە.
ئەوجا گەڕایەوە بۆ لای ڕێوی.
گوتی:
– خوات لەگەڵ!
ڕێوی گوتی:
– خوات لەگەڵ!... ئێستاش گوێ لە ڕازەکەم بگرە. ڕازێکی زۆر سادەیە: بە چاوی دڵ نەبێت، هیچ شتێک وەک خۆی نابینرێت. ئەوەی گرنگترینە چاو لە ئاستیدا نابینایە.

شازادەچکۆل بۆ ئەوەی لە بیری نەکات بۆ خۆی دووبارە کردەوە:
– ئەوەی گرنگترینە چاو لە ئاستیدا نابینایە.
– نرخی گـوڵەکـەی تۆ بە قـەدەر ئەو تەمـەنەیە کـە تۆ لە پێناویدا بەختت کردووە.
شازادەچکۆل دووبارەی کردەوە:
– ... بەقەدەر ئەو تەمەنەیە کە لە پێناویدا بەختم کردووە.
ڕێوی گوتی:
– مرۆڤـەکان ئەم حەقیقەتە سادە و سـاکارەیان فەرامـۆش کردووە، بەڵام تۆ دەبێت لە بیـری نەکـەیت. ئەگـەر تۆ شـتـێکت مـاڵی کـرد، خـووت بە شـتـێکەوە گـرت، ئیـتـر تا ئەو ڕۆژەی کـە زیندوویت، بەرپرسی ئەو شتەیت. تۆ بەرپرسی گوڵەکەتی...
شازادەچکۆل بۆ ئەوەی لە بیری نەکات، دووپاتی کردەوە:
– من بەرپرسی گوڵەکەمم.



ئەمجا خۆی بەسەر گژوگیاکەدا دا و دەستی کرد بە گریان.

## ٢٢

شازادەچکۆل گوتی:

- سڵاو.

ڕێنوێنی شەمەندەفەر گوتی:

- سڵاو.

شازادەچکۆل گوتی:

- تۆ لێرە چی دەکەیت؟

ڕێنوێنی شەمەندەفەر گوتی:

- گەشتیارەکان بە سەر چەندین دەستەی هەزاریدا دابەش دەکەم و بە شەمەندەفەرەکان ڕەوانەیان دەکەم. هەندێکیان بۆ لای ڕاست و هەندێکیان بۆ لای چەپ دەنێرم.

ڕێک لەو کاتەدا شەمەندەفەرێکی تیژڕەو بە چرای داگیرساوەوە وەکوو هەورەتریشقە گرمەی کرد، ژووری کابرای خستە لەرزین و تێپەڕی.

- زۆر بەپەلەن! لە چی دەگەڕێن؟

کابرای ڕێنوێن گوتی:

- تەنانەت لێخوڕی شەمەندەفەریش نازانێت بۆ کوێ دەڕوات!

تیژڕەوێکی تر گرمەیەکی کرد و بەپێچەوانەوەی ئەوی پێشووەوە تێپەڕی.

شازادەچکۆل لێی پرسی:

- هەر وا زوو گەڕانەوە؟

کابرای ڕێنوێن گوتی:

- ئەمانە هەر ئەوان نین. ئەوان ڕۆیشتن و ئەمانەش گەڕانەوە.
- ئەو شوێنەیان پێ خۆش نەبوو کە بۆی چووبوون؟
کابرای ڕێنوێن گوتی:
- مرۆڤ هەرگیز ئەو شوێنەی پێ خۆش نییە کە لێیەتی.
گرمەی تیژڕەوی سێیەمیش بیسترا و تێپەڕی.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
- ئەمانە بەدوای گەشتیارەکانی تردا دەڕۆن؟
کابرای ڕێنوێن گوتی:
- ئەمانە بەدوای هیچ شتێکدا ناڕۆن. یان خەوتوون یان باوێشک دەدەن. تەنیا منداڵەکانن کە لووتیان بە شووشەی پەنجەرەکانەوە دەنووسێنن.
شازادەچکۆل گوتی:
- تەنیا منداڵەکان دەزانن لە چی دەگەڕێن. تەنیا منداڵەکان کاتێکی زۆر بۆ بووکەپەڕۆینەکانیان تەرخان دەکەن و بووکەکەیان هێندە بەلاوە بەنرخە کە ئەگەر کەسێک لێیان بستێنێت، دەست بە گریان دەکەن...
کابرای ڕێنوێن گوتی:
- منداڵان بەختیارن.

## ٢٣

شازادەچکۆل گوتی: "ڕۆژباش!"
بازرگان گوتی: "ڕۆژباش."

ئەم کـابرایە، فـرۆشـیـاری حـەبی زۆر سـەیر و سـەمـەرە بوو. تینوویێتـیـان دەشکاند. کـڕیار حـەبێکی قـووت دەدا و ئیـتـر تا حەفتەیەک هەستی بە تینوێتی نەدەکرد.
شازادەچکۆل لێی پرسی:
– جا ئەمانە بۆچی دەفرۆشیت؟
بازرگان گوتی:
– ئەگـەر مـرۆڤ ئـەم حـەبانە بە کـار بهـێنێت، کـاتێکی زۆری بۆ دەگـەڕێتـەوە. لێزانە پسـپۆڕەکان دانیـشـتوون و لێکیان داوەتەوە ئەگەر هەرکەسێک ئەم حەبە بخوات، لە ماوەی حەفتەیەکدا پەنجا و سێ دەقیقە لە کاتی بە فیڕۆ ناچێت.
– دەی باشە، ئەوسا چی لەو پەنجا و سێ دەقیقەیە دەکات؟
– چۆن ئارەزوو بکات وایان لێ دەکات...
شازادەچکۆل لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: "من ئەگەر پەنجا و سێ دەقیقە کاتی زیادەم هەبا، دەمودەست ڕێگای کانیاوێکم دەگرتە بەر..."



## ٢٤

هەشت ڕۆژ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی کە بە ناچاری بە فڕۆکەکەم لەو بیابانەدا نیشتبوومەوە و لە کاتێکدا خەریکی خواردنەوەی دوا تنۆکە ئاوی پاشەکەوتکراوم بووم، گوێم بۆ سەرهاتی کابرای بازرگان شل کردبوو.

بە شازادەچکۆلم گوت:

– بیرەوەرییەکانت گەلێک خۆش و جوانن، بەڵام من هێشتا نەمتوانیوە فڕۆکەکەم چاک بکەمەوە و تنۆکە ئاوێکیشم لا نەماوە. منیش بەختەوەر دەبم ئەگەر بمتوانیبا دەمودەست ڕێگای کانیاوێک بگرمە بەر!

شازادەچکۆل گوتی:

– ڕێویەکەی برادەرم...

گوتم:

– هاوڕێ بچکۆلانەکەم، واز لە ڕێوی بێنە و چیتر ڕێوی دادمان نادات!

– بۆ؟

– چونکە لە تینوویێتیدا دەمرین.

تێم نەگەیشت و لە وەڵامدا گوتی:

– ئەگەر مرۆڤ لە سەرەمەرگیشدا بێت، هەبوونی هاوڕێیەک هەر شتێکی باشە. من دڵشادم بەوەی کە ڕێوییەک هاوڕێم بووە...

بەڵام هاوکاتیش وا سەیری کردم وەکوو ئەوەی لەوە تێ بگات بیر لە چی دەکەمەوە:

- منیش تینووم... وەرە با بڕۆین چاڵاوێک بدۆزینەوە...
بە نابەدڵییەوە کەوتمە خۆ. گەڕان بە دوای چاڵاوێکدا لە بیابانێکی بێ سەروبەردا هەر لە خۆوە بێمانایە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش وە ڕێ کەوتین.
لە کاتێکدا کە چەند ساتێک بە بێدەنگی بە بیاباندا گەڕابووین. تاریکی داهات و ئەستێرەکان دەستیان بە درەوشانەوە کرد. وەکوو ئەوە بوو لە خەوندا بیانبینم، چونکە تینووێتی بڕستی لە بەر بڕیبووم. نەشمدەتوانی قسەکانی شازادەچکۆل لە سەرم دەربکەم، لێم پرسی:
- کەواتە تۆش تینوویت؟
کەچی وەڵامی نەدامەوە و بە ساکارییەوە گوتی:
- هەروەها ئاو بۆ دڵیش باشە...
لە قسەکەی تێنەگەیشتم، بەڵام هیچیشم نەوت. ئاخر دەمزانی کە نەدەبوو پرسیاری لێ بکەیت.
ماندوو بوو. دانیشت. منیش لە تەنیشتییەوە دانیشتم. دوای تاوێک بێدەنگی گوتی:
- ئەستێرەکان جوانن، چونکە لەو سەرەوە گوڵێک هەیە کە پیاو بە چاو نایبینێت...
گوتم:
- بێگومان!
ئەوجا بە بێدەنگی کەوتمە تێڕامانی چین چینەکانی لمەکە لەبەر تریفەی مانگەشەودا.

دیسان گوتی:
- بیابانیش جوانە.
ڕاستی دەکرد. من هەمیشە ئاشقی بیابان بووم. مرۆڤ لەسەر تەپۆڵکێک لمی خزۆک دادەنیشێت. هیچ شتێک نابینێت. هیچ شتێک نابیستێت. بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەست دەکات شتێک خەریکە لە بێدەنگیدا دەدرەوشێتەوە...
شازادەچکۆل گوتی:
- تۆ پێتوایە ئەوە چییە بیابانی هێندە جوان کردووە؟ چاڵاوێک لە شوێنێکی بیاباندا خۆی حەشارداوە...
لەپڕێکدا لە نهێنیی درەوشانەوەی بێهاوتای لم گەیشتم. کە مناڵ بووم، ماڵمان لە خانوویەکی کۆندا بوو. دەنگۆیەک هەبوو گوایە گەنجینەیەک لەو ماڵەدا حەشار دراوە. کەچی هیچ کەس بۆی نەدۆزرابووەوە و لەوانەیە هیچ کەسیش بەدوایدا نەگەڕابێت. بەڵام ئەو دەنگۆیە بووبووە جادوویەک و سەرلەبەری ماڵەکەمانی داپۆشیبوو. ماڵەکەمان لە قووڵایی دڵیدا نهێنییەکی حەشار دابوو.
بە شازادەچکۆلم گوت:
- بەڵێ، ماڵ، ئەستێرە، یان بیابان فەرق ناکات. ئەوەی کە جوانیان دەکات شتێکی هەمیشە نەبینراوە.
گوتی:
- پێمخۆشە لەگەڵ ڕێویەکەمدا هاوبیریت.
کە شازادەچکۆل خەوی لێ کەوت، لە باوەشم گرت و وە ڕێ کەوتم. دەست و دڵم دەلەرزی. وەک ئەوە بوو شتێکی گەلێک بەنرخم هەڵگرتبێت. پێموابوو لەم دنیایەدا هیچ شتێک لەو ناسکتر نییە.

سەیری هەنیە ڕەنگپەڕیوەکەی، چاوە داخراو و سەر و قژیم دەکرد کە بەدەم شنەی باوە دەشنایەوە و بیرم کردەوە: "ئەوەی کە دەیبینم تەنیا ڕووالەتە. بەنرخترین شت ئەوەیە کە هەرگیزاوهەرگیز بە چاو نابینرێت..."
کاتێک کە وەک ئەوە وا بوو بەدەم خەونەوە بزە بیگرێت، دیسان بیرم کردەوە: "ئەو شتەی کە لە هەمووشتێکی تر کاریگەرترە، کاتێک سەیری شازادەچکۆلەکە دەکەم، وەفاداریی ئەوە لە ئاست گوڵێکدا. ئەوە وێنەی گوڵێکە کە لە ناخی ئەودا، تەنانەت ئەو کاتانەش کە نووستووە، دەدروشێتەوە وەک چۆن ڕووناکی لەنێو چرا دەگرێت..." هەستم کرد لەوەش ناسکترە کە هەیە. دەبێت چراکان بپارێزین، نەرمەبایەکیش دەتوانێت بیانکوژێنێتەوە...
هەروا بە ڕێوە بووم کە دەمەوبەیان چاوم بە چاڵاوەکە کەوت.

## ٢٥

شازادەچکۆل گوتی:
– مرۆڤەکان!... خۆ لە شەمەندەفەرە تیژڕەوەکان دەئاخنن، بەڵام نازانن لە چی دەگەڕێن. هەربۆیەش سەراسیمە دەبن و هەر بەو نێوەدا دەخولێنەوە...
دواتر بەردەوام بوو:
– دنیا ئەوە ناهێنێت...
ئەو چاڵاوەی دۆزیبوومانەوە لە هیچ چاڵاوێکی دیکەی بیابان

نەدەچوو. چالاوەکانی بیابان، چاڵی قووڵن و لە لمدا هەڵکەنراون. ئەمەیان لە چالاوی لادێیەک دەچوو، کەچی هیچ ئاوەدانییەک لەو دەوروبەرە دیار نەبوو و منیش وامدەزانی خەون دەبیبنم.
گوتم:
- سەیرە! هەموو شتێک ئامادەیە: جەنجەڕ، سەتڵ و گوریس...
لە قاقای پێکەنینی دا. گوریسەکەی ڕاکێشا و جەنجەڕەکەی خستە گەڕ. جەنجەڕیش وەک بانوێنێکی کۆن کە ماوەیەکی دوورودرێژیش دوای کپبوونی با جیرەی لێوە دێت، کەوتە جیرەجیر.
گوتی:
- گوێت لێیە، ئێمە چالاوەکەمان لە خەو هەڵساندووە و ئەویش خەریکە گۆرانیمان بۆ دەڵێت...
نەمویست خۆی ماندوو بکات. پێمگوت:
- با من خەریک بم، قورسە و بە تۆ ناکرێت.
هێدی هێدی سەتڵەکەم سەر خست و لەسەر لێواری چاڵەکەم دانا. هێشتا ئاوازی جەنجەڕەکە لە گوێمدا دەزرنگایەوە و لە لەرینەوەی ئاوەکەشدا درەوشانەوەی خۆرەتاوم دەبینی.
گوتی:
- من تاسە و ئارەزووی ئەم ئاوە دەکەم، بمدەرێ با بیخۆمەوە.
ئەوجا تێگەیشتم کە بە شوێن چیدا گەڕاوە!
سەتڵەکەم بۆ بەرز کردەوە. چاوی لێکنا و بینی پێوەنا. وەک ئاهەنگێک خۆشی و ئاسوودەیی بە گیان دەبەخشی. ئەو ئاوە ئاوێکی ئاسایی نەبوو و زادەی ئاوازی جەنجەڕەکە، هەوڵ و



له قاقای پێکەنینی دا. گوریسەکەی ڕاکێشا و جەنجەڕەکەی خستە گەڕ.

کۆشــشی باسکەکـانـی من و ڕێکردنـی ئێـمــە بوو لەبـەر تیـشکی ئەستێراندا. وەکو دیارییـەک بوو کە سووکنایی بە دڵ دەبەخشێت. کــە منـاڵ بووم، ڕووناکــایـی درەخـــتی جــەژنی ســـەری ســـاڵ، گـۆرانیـیـەکـانی شــەوی جـەژنی کـریسـمس و پێکەنینە نەرم و نیـانەکـان، ڕێک بەم چەشنـە جـەژنانەمـیـان دوو بەرابـەر جـوانتـر دەکرد.

شازادەچکۆل گوتی:

– خــەڵکی ئەســتـێـرەکــەی تۆ، پێنـج هـەزار گـوڵ لە گـوڵجـارێکدا دەچێنن، کـەچی قـەت ناتوانن گـوڵەکـەی خـۆیان لەنێـو ئەو هـەمـوو گوڵەدا بدۆزنەوە...

گوتم:

– نا، قەت نایدۆزنەوە.

– سـەرەڕای ئەمـەش، دەکـرێت ئەوەی لێی دەگـەڕێن لە تاکـەگوڵێک یان چۆڕەئاوێکدا بیدۆزنەوە...

وەڵامم دایەوە:

– بێگومان هەر وایە.

دیسان گوتی:

– بەڵام چاوەکان کوێرن. دەبێت بە دڵ بگەڕێین.

تینوێتـیم شکابوو. لـەسـەرەخــۆ هـەناســەم دەدا. ڕەنگی لم لـە ژێر تیـشکی خـۆری بەیانیـاندا لە ڕەنگی هـەنگوین دەچێت. مـنیش بەو ڕەنگە شاد و بەختەوەر بووم. بۆ دەبوو لە خۆمی تێک بدەم...

شازادەچکۆل کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، بە نەرمی و هێمنی، پێی گوتم:

- بەڵێنەکەت لە بیر نەکەیت، ها!
- کام بەڵێن؟
- دەزانیت... دەمبێنێک بۆ بەرخەکەم... ئاخر من بەرپرسی گوڵەکەی خۆمم!
ئەو وێنانەی هەوڵم دابوو بیانکێشم لە گیرفانم دەرهێنان. سەیری کردن و بە پێکەنینەوە گوتی:
- باوبابەکانت نەختێک لە کەلەرم دەچن.
- ئای لە من!
من کە شانازیم بە باوبابەکانمەوە دەکرد.
- ڕێوییەکەشت... گوێیەکانیت بینیوە! نەختێک لە قۆچ دەچن و... زۆریش درێژن.
دیسان لە قاقای پێکەنینی دا.
- براله گیان، هێندەش بێ ویژدان مەبە. ئاخر من قەت بێجگە لەو وێنانەی کە ماری بووا لە دەرەوە و لە ناوەوە پێشان دەدەن هیچ وێنەیەکی دیکەم نەکێشاوە.
گوتی:
- دەی باشە، گرنگ نییە. هەمیشە منالان تێدەگەن.
دەمبێنێکم بۆ کێشا و بە دڵێکی پڕ لە حەسرەتەوە دامە دەستی:
- تۆ پلانی خۆتت هەن و منیش لێیان بێئاگام...
وەڵامی نەدامەوە. بەڵکوو هەر هێندەی گوت:
- سەیرکە... بەیانی ساڵڕۆژی بەربوونەوەمە بۆ سەر زەوی.
دوای تاوێک بێدەنگی بەردەوام بوو:
- هەر لەم دەوروبەرەدا نیشتمەوە.

ئەوجا ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەڕان.
منیش سەرلەنوێ و نازانم لەبەر چی خەمێکی قورس دایگرتمەوە. سەرەڕای ئەمەش پرسیارێکم بە مێشکدا هات:
– کەواتە بە ڕێکەوت نەبوو کە هەشت ڕۆژ بەر لە ئێستا، ئەو بەیانییە، لە کاتێکدا کە تاک و تەنیا و هەزار میل دوور لە گشت ئاوەدانییەک دەگەڕایت، تووشم بوویت. ئاخۆ خەریک بوویت دەگەڕایتەوە ئەو شوێنەی لێی دابەزیبوویت؟
دیسان سوور هەڵگەڕا و منیش بە دوودڵییەوە درێژەم بە قسەکانم دا:
– یان ئاخۆ هەر لەبەر ئەوەیە کە ساڵێک بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیوە؟
دیسان سوور هەڵگەڕایەوە. ئەو هەرگیز وەڵامی پرسیاری نەدەدایەوە، بەڵام کاتێ کەسێک سوور هەڵدەگەڕێت مانای ئەوەیە کە "قسەکەت ڕاستە!"، وا نییە؟
پێمگوت:
– ئاخر، دەترسێم کە...
قسەکەی پێ بڕیم:
– تۆ ئیتر دەبێت بڕۆیت بە لای کاری خۆتەوە. دەبێت بگەڕێیتەوە لای فڕۆکەکەت. منیش لێرە چاوەڕێت دەکەم. سبەینێ دەمەوئێوارە وەرەوە...
بەڵام من هەستم بە ئارامی نەدەکرد. بیرم لە ڕێوییەکە دەکردەوە. ئەگەر هێشتت کەسێک ماڵیت بکات، خۆشت دەخەیتە بەر مەترسیی ئەوەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان فرمێسک هەڵڕێژیت.

لە تەنیشت بیرەکەوە شوێنەواری دیوارێکی بەردین هەبوو. ئێوارەی ڕۆژی دواتر کە لە کار گەڕامەوە، لە دوورەوە شازادەچکۆلم بینی کە لەسەر دیوارەکە دانیشتووە و هەردوو قاچی شۆڕ کردۆتەوە، کە لێی نزیک کەوتمەوە گوێم لێ بوو دەیگوت:

- بەڵام تۆ لە بیرت نەماوە؟ کتومت ئێرە نەبوو!

دیار بوو دەنگێک وەڵامی دایەوە، چونکە شازادەچکۆل لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو:

- ئەی چۆن! ئەمڕۆیە، بەڵام ئا لەم جێیەدا نەبوو...

زیاتر لە دیوارەکە نزیک بوومەوە. کەچی نە کەسم بینی و نە دەنگی هیچ بوونەوەرێکیشم بیست. بەڵام لەوە دەچوو شازادەچکۆل وەڵامی پرسیارێکی تر بداتەوە:

- ... بێگومان، خۆت دەتوانی شوێنپێم لەسەر لمەکە ببینیت و بزانیت لەکوێوە دەست پێ دەکات. هەر لەوێ چاوەڕێم بکە. کە دنیا تاریک بوو، دێم.

بیست مەترێک لە دیوارەکەوە دوور بووم و هێشتا هیچم نەدەبینی. شازادەچکۆل، دوای نەختێک، بەردەوام بوو:

- ئەرێ ژەهرەکەت باشە؟ دڵنیایت کە ئازارەکەم درێژخایەن نابێت؟

بە دڵێکی پڕ لە حەسرەتەوە لە شوێنی خۆم وەستام، بەڵام هێشتا نەمدەزانی چ باسە.



– دەی باشە، ئێستا برۆ. – دەمەوێت بێمە خوارەوە!

گوتی:
– دەی باشە، ئێستا بڕۆ. – دەمەوێت بێمە خوارەوە!
ئەوسا سەیری بن دیوارەکەم کرد و لە شوێنی خۆم هەڵبەزیمەوە! یەکێک لەو مارە زەردانەی لە سی چرکەدا مرۆڤ دەکوژن، ڕووەو شازادەچکۆل خۆی هەڵبڕیبوو. من لەو کاتەدا کە دەستم بۆ گیرفانم بردبوو تا دەمانچەکەم دەربهێنم، بازێکم بۆ لای دیوارەکە دا، بەڵام مارەکە بە بیستنی تەپەی پێم وەک جۆگەلەیەک بەنێو لمەکەدا داچۆڕا، زرینگەی لێوە هات و خۆی کرد بەنێو بەردەکاندا و ون بوو.
من ڕێک لە کاتی خۆیدا گەیشتمە لای دیوارەکە و شازادەچکۆلم لە ئامێز گرت. ڕەنگی وەکوو بەفر سپی بووبوو.
– ئەمە یانی چی! لەگەڵ مارانیش دەدوێیت!
ملپێچە زەردەکەیم، کە هەمیشە لە ملیدا بوو، خاو کردەوە. نەختێک ئاوم پرژاندە سەر ئەملا و ئەولای نێوچەوانی و چۆڕێک ئاوم بە قوڕگیدا کرد. چیتر نەموێرا هیچی لێ بپرسم. بە ماقووڵییەوە لێی ڕوانیم و دەستی لە ملم کرد. هەستم بە لێدانی دڵی کرد کە وەک باڵندەیەکی بریندار کە خەریکە مردار دەبێتەوە، لێی دەدا.
پێی گوتم:
– خۆشحاڵم کە توانیوتە فڕۆکەکەت چاک بکەیتەوە. ئێستا دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆماڵەوە.
– تۆ چووزانیت؟
ڕێک لەو کاتەدا بەتەما بووم پێی بڵێم کە سەرەڕای ئەوەش کە هیچ

هیوایەکم نەمابوو، توانیومە کارەکانم جێبەجێ بکەم...
وەڵامی پرسیارەکەی نەدامەوە و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- منیش ئەمڕۆ دەگەڕێمەوە ماڵی خۆم...
ئەوسا بە خەفەتەوە گوتی:
- ماڵەکەی من زۆر دوورترە... گەڕانەوەیش زۆر سەختتر...
هەستم کرد خەریکە شتێکی سەیر ڕوو دەدات. توند، وەکوو کۆرپەیەک، نووساندم بە خۆمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەچوو بەبێ ئەوەی هیچم لە دەست بێت و بتوانم لە باوەشمدا ڕایگرم، بەر بێتەوە و بە قووڵاییەکدا ڕۆ بچێت.
چاوی لە شوێنێکی دوور دوور بڕیبوو.
گوتی:
- بەرخەکەتم پێیە. سندووق و دەمبێنەکەش...
ئەوجا بە دڵێکی پڕەوە بزەی کەوتە سەر لێوان.
تاوێک چاوەڕێ بووم. هەستم کرد خەریکە خوێنی تێ دەگەڕێتەوە.
- چکۆلە خۆشەویستەکەم، تۆ ترسابوویت...
- ئەمشەو زۆر لەوەش زیاتر دەترسێم...
دیسان هەستکردن بە ڕوودانێک کە مرۆڤ نەتوانێت لە ئاستیدا هیچ کارێک بکات، تەزووی بە گیانمدا هێنا و ئەوەشم لە لا ڕوون بووەوە کە بەرگەی ئەوە ناگرم گوێم لە قاقای پێکەنینەکەی ئەو نەبێت، پێکەنینی ئەو بۆ من وەکو کانیاوێکی نێو بیابان بوو.
- بچکۆلە گیانەکەم، دەمەوێت جارێکی دیکەش قاقای پێکەنینت ببیستم.
بەڵام ئەو گوتی:

– ئەمشەو، ڕێک دەبێتە یەک ساڵ. ئەستێرەکەم دەگاتەوە ئەو شوێنەی کە پار لێوەی دابەزیمە سەر زەوی.
– بچکۆلە گیانەکەم، ئەرێ چیرۆکی مار و ئەستێرە بە تەنیا خەونێکی ناخۆش نییە!
وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە. هەر ئەوەندەی گوت:
– هەر شتێک بەنرخ بێت، بە چاو نابینرێت.
– بێگومان.
– لەمەڕ گوڵەکەشەوە هەر وایە. ئەگەر گوڵێکت خۆش بووێت کە لە ئەستێرەیەکدایە، ئیتر بینینی ئاسمان لە شەودا چێژێکی تری هەیە. گشت ئەستێرەکانیش سەرڕێژی گوڵن.
– بێگومان...
– لەمەڕ ئاویشەوە هەر وایە. ئەو ئاوەی لە دەستی تۆم وەرگرت و خواردمەوە، جەنجەڕ و گوریسەکە کردبوویان بە مۆسیقا... لە بیرتە... ئای کە خۆش بوو!
– بەڵێ وایە...
– شەوانە تەماشای ئەستێرەکان بکە. ئەستێرەکەی من گەلێک لەوە بچووکترە کە بتوانم لە ئاسماندا ئاماژەی بۆ بکەم. بەڵام قەیناکا! بیر لە ئەستێرەکەی منیش وەکوو ئەستێرەیەک لەنێو گشت ئەستێراندا بکەرەوە. ئەوجا بە هەمان شێوە حەز لە گشت ئەستێرەکان دەکەیت... هەموویان دەبن بە هاوڕێت... ئەرێ بەڕاست، دەمەوێت دیارییەکت پێشکەش بکەم...
دیسان لە قاقای پێکەنینی دا.
– ئاخ، بچکۆلە گیانەکەم، بچکۆلەکەم! من شێت و شەیدای

بیستنی پێکەنینەکەتم!
– دیارییەکەی منیش ڕێک ئەمەیە... وەکوو ئاوەکەیە...
– مەبەستت چییە؟
– هەرکەس ئەستێرەی خۆی هەیە و هیچ ئەستێرەیەکیش لە ئەستێرەی تر ناچێت. گەشتکەران ئەستێرەی ڕێنیشاندەری خۆیان هەیە. بۆ هەندێ کەسی دیکەش ئەستێرەکان بێجگە لە ترووسکەی ڕووناکایی هیچی تر نین. بۆ ئەهلی زانست کێشە و گرفتن و بۆ بازرگانەکەی لەمەڕ خۆشمان زێڕن. بەڵام ئەو ئەستێرانە بێدەنگن. تۆش دەبیتە خاوەنی ئەستێرەگەلێک کە هیچ کەس ئەستێرەی وایان نییە.
– مەبەستت چییە؟
– کاتێک شەوانە سەر بۆ ئاسمان هەڵدەبڕیت و لە ئەستێرەکان دەڕوانیت پێتوایە کە هەموویان پێکڕا پێدەکەنن، چونکە من لە یەکێک لەو ئەستێرانەدام و خەریکم پێدەکەنم.
کەواتە تۆ دەبیتە خاوەنی ئەو ئەستێرانەی پێدەکەنن!
دیسان لە قاقای پێکەنینی دا.
– کە سووکناییش کەوتە دڵتەوە (مرۆڤ هەمیشە دڵی خۆی دەداتەوە) بە ناسینم خۆشحاڵ دەبیت. دەبیتە هاوڕێی هەمیشەییم. ئارەزووی ئەوە دەکەیت پێکەوە پێبکەنین. بۆ ئەوەی دڵشادیش بیت، هەندێک جار پەنجەرەی ژوورەکەت دەکەیتەوە... ئەوجا کە لە ئاسمان دەڕوانیت پێدەکەنیت، هاوڕێکانت پێیان سەیر دەبێت. تۆش پێیان دەڵێیت: "بەڵێ، ئەستێرەکان هەمیشە دەمهێننە پێکەنین!" ئەوانیش وا دەزانن کە شێت بوویت. گیان!

دەبینیت چ فێڵێکم لێکردوویت...
هەمدیس لە قاقای پێکەنینی دا.
- ئەمەش وەک ئەوە وایە لەبری ئەستێرەکان، کۆمەڵە زەنگوڵەیەکم پێ بەخشیبیت کە دەتوانن پێ بکەنن...
دیسان لە قاقای پێکەنینی دا. بەڵام لەپڕێکدا بە جیددییەوە گوتی:
- ئەمشەو... خۆت دەزانیت... مەیە!
- هەروا بە جێت ناهێڵم!
- وەکو ئەوە وایە ئازارم هەبووبێت... وەکو ئەوەی مردبێتم... ئاوایە ئیتر. حەز ناکەم بێیت و تەماشام بکەیت. بۆ لە هیچ و خۆڕایی نارەحەت ببیت...
- هەروا بە تەنیا جێت ناهێڵم.
خەم دایگرتبوو.
- ئەمەت... لەبەر مارەکە پێ دەڵێم. نابێت پێتەوە بدات. مار بەدفەڕ و چەپەڵن. تەنانەت بۆ خۆشیش دەتوانن پێتەوە بدەن.
- بە جێت ناهێڵم!
بەڵام لەپڕێکدا شتێک ئارامی کردەوە:
- خۆ ئەوەش زۆر ڕاستە - مارەکان هەرجارە و تەنیا بەشی گەستنی کەسێک ژاریان هەیە...
ئەو شەوە قەت لە ڕۆیشتنی بەئاگا نەبووم. بێ دەنگ و خشپە ون بوو. کە پێی گەیشتمەوە بە هەنگاوی ڕێک و لێبڕاوانە دەڕۆیشت. گوتی:
- ئای! ئەوە لێرەیت...
ئەوجا دەستمی گرت. بەڵام هێشتا هەر نائارام بوو:

– ناهەقیت کرد. ئاخر عاجز دەبیت. ئەمە وەکوو ئەوە دەبێت کە مردبێتم، بەڵام لە ڕاستیشدا وا نییە...

دەنگم نەکرد.

– خۆت دەزانیت. ڕێگاکەم گەلێک دوورە. ناتوانم لەشم لەگەڵ خۆمدا ببەم. زۆر قورسە.

دەنگم نەکرد.

– وەکوو کەوڵێکی کۆنی بەجێهێڵراوی لێ دێت. کەوڵی کۆنیش خەمی بۆ بە با ناکرێت.

دەنگم نەکرد.

نەختێک خەم دایگرت، بەڵام هەر زوو خۆی گورج کردەوە:





- بڕوا بکە! زۆر خۆش دەبێت. منیش تەماشای ئەستێرەکان دەکەم. هەموویان وەکوو ئەو چالاوانەیان لێ دێت کە جەنجەڕەکانیان ژەنگیان هەڵهێنابێت. هەموویان ئاوم دەدەنێ بیخۆمەوە...
دەنگم نەکرد.
- زۆر خۆش دەبێت! تۆ دەبیتە خاوەنی پێنج سەد ملیۆن زەنگوڵە و منیش خاوەنی پێنج سەد ملیۆن بیر...
ئەوجا ئەویش بێ دەنگ بوو، چونکە دەگریا...
- دەی باشە، بهێڵە با نەختێک بە تەنیا بڕۆم.
پاشان دانیشت، چونکە دەترسا.
- خۆت دەزانیت... مەبەستم گوڵەکەمە... ئاخر من بەرپرسیی

گوڵەکەمم لەسەر شانە! ئەویش زۆر بێهێزە! زۆر دڵپاک و بێفیزە. تەنیا چوار دڕکی بەستەزمانی هەیە و هەر بەوانیش لە ئاست هەموو دنیادا خۆی دەپارێزێت.
منیش دانیشتم، چونکە ئیتر نەمدەتوانی بە پێوە بوەستم.
گوتی:
– هەر ئەمەیە... هەر ئەمە و هیچی تر نا...
هێشتا نەختێک دوودڵ بوو، بەلام دیسان هەڵسا و هەنگاوێکی هەڵێنا. من نەمتوانی لە شوێنی خۆم بجوڵێمەوە.
لەپاڵ پاژنەیەوە، بریسکەیەکی زەرد هەڵبەزییەوە. بۆ تاوێک بەبێ جووڵە لەوێدا وەستا. نەیقیژاند. وەکوو درەختێک، بەنەرمی، بە لادا هات. لەبەر نەرموشلیی لمەکەش، هیچ دەنگێک نەبیسرا.

## ٢٧

ئەمێستا بە لانی کەمەوە شەش ساڵ بەسەر ئەو شەوەدا تێپەڕیوە... قەت پێشتر ئەم چیرۆکەم نەگێڕاوەتەوە. کە بە زیندوویی گەڕامەوە، هاوڕێکانم گەلێک خۆشحاڵ بوون. من دڵم خەمبار بوو، بەلام پێمگوتن: "لەبەر ماندوویێتییە..."
ئێستا کەمێک دڵی خۆم داوەتەوە. بەتەواوی نا... بەلام بە دڵنیاییەوە دەزانم کە ئەو گەڕاوەتەوە بۆ ئەستێرەکەی خۆی، چونکە کە خۆر دەرکەوت نەمتوانی لاشەکەی بدۆزمەوە. هێندە قورسیش نەبوو... شەوانیش حەز دەکەم گوێ لە جریوەی ئەستێرەکان بگرم. وەکوو پێنج سەد ملیۆن زەنگوڵەن...



وەکوو درەختێک، بەنەرمی، بە لادا هات.

بەڵام هەندێک جار شتی دەگمەن ڕوو دەدات. لە بیرم چووبوو قایشێکی چەرمین بکەم بەو دەمبێنەوە، کە بۆ شازادەچکۆلم کێشا. دیاریشە کە قەت ناتوانێت بیکاتە سەری بەرخەکەی. بۆیە ئێستا لە خۆم دەپرسم: " ئاخۆ لە ئەستێرەکەیدا چی قەوماوە؟ لەوانەیە بەرخەکە گوڵەکەی خواردبێت..."
هێشتا بە خۆم دەڵێم: "بێگومان وا نییە! شازادەچکۆل هەموو شەوێک گوڵەکەی دەخاتە ژێر شووشەبەندێکەوە، بە چاکییش پاسی بەرخەکەی دەکات..." ئەوجا ئاسوودە و بەختەوەر دەبم و ئەستێرەکانیش بەنەرمی پێدەکەنن.
هێشتا بە خۆم دەڵێم: "هەندێک جار بیری مرۆڤ پەرش و بڵاو دەبێت و هەر هێندەش بەسە بۆ ئەوەی هەر شتێک ڕوو بدات! بیهێنە پێش چاوی خۆت، ئەگەر ئێوارەیەک، شازادەچکۆل شووشەبەندەکەی لە بیر چوو، یان بەرخەکە لە نیوەشەودا بە بێدەنگی و پێدزکێ لە سندووقەکەی هاتە دەرەوە..." ئەوسا گشت زەنگۆڵەکان دەبن بە فرمسێک!...
ڕازێکی زۆر گرنگ لێرەدایە. بۆ من، بۆ تۆش کە شازادەچکۆلت خۆش دەوێت، دەتوانێت گەردوون بە شێوەیەکی جیاواز بنوێنێت. ئەمەش بەستراوە بەوەوە کە ئاخۆ لە جێیەک لەم دنیا پان و بەرینەدا بەرخۆلەیەکی نەناسراو گوڵێکی خواردووە یان نا...
- تەماشایەکی ئاسمان بکەن! لە خۆتان بپرسن: "ئاخۆ بەرخەکە گوڵەکەی خواردووە یان نا؟" ئەوسا دەبین چۆن هەموو شتێک دەگۆڕدرێت...
دەشبینن کە هیچ گەورەیەک لەوە تێ ناگات کە ئەوە چ گرنگییەکی گەورەی هەیە!

ئا لێرەدا تۆ جوانترین و گرانترین دیمەن لە سەرانسەری دنیادا دەبینیت. هەمان دیمەنە کە لە لاپەڕەی پێشووتردا هەیە، بەڵام کێشاومەتەوە بۆ ئەوەی بە چاکی پێشانت بدەم. ئا لێرەدا بوو کە شازادەچکۆل دابەزییە سەر زەوی و هەر لێرەشدا سەرلەنوێ ون بووەوە.

بە چاکی لەم دیمەنە ورد بەرەوە، تا بەتەواوی لەوە دڵنیا بیت کە، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێگات کەوتە بیابانەکانی ئەفریقادا دەیناسیتەوە. خۆ ئەگەر ڕێت کەوتە ئەو شوێنەش، ئەوا تکات لێ دەکەم: پەلە مەکە، نەختێک لە ژێر ئەستێرەکەدا بوەستە! ئەوسا ئەگەر کوڕێکی چکۆلە بەرەو ڕووت هات، ئەگەر پێکەنی، ئەگەر قژی زەرد و زێڕین بوو، ئەگەر وەڵامی هیچ پرسیارێکی نەدایەوە، ئەوە بێگومان دەزانیت کێیە. تکا دەکەم هەر ئەوساش بیر لە من بکەرەوە کە چەندێ دڵتەنگ و خەمبارم: دەمودەست بۆم بنووسە و باسی ئەوەم بۆ بکە کە شازادەچکۆل گەڕاوەتەوە...





